## شەرحی

# (عُمدة الطُّلاب)

«١٠٦ بەیت شیعر»

## لە زانستی ئوصولی فیقهدا

نووسینی


الشيخ عباس المدني الشافعي

شەرح، ولێکدانەوەی

عەبدوللا مەلا ئەحمەد، ئەحمەدئاوایی




شەرحی

# (عُمْدَةُ الطُّلَّابْ)

١٠٦ بەیت شیعر

له زانستی ئوصولی فیقهدا

نووسینی

الشيخ عباس المدني الشافعي

شەرح، ولێکدانەوەی

عەبدوللا مەلا ئەحمەد، ئەحمەدئاوایی

ناریـن

# پێشەکی ڕاڤیاری کوردی

﴿ بسم الله الرحمن الرحیم ﴾

إنَ الحَمدَ لِلّـهِ نَحْمَـدُهُ وَ نَـستَعينُهُ ونَـستَغْفِرُهُ، وَ نَعُـوذُ بـالله مِـنْ شُـرُورِ أنْفُـسِنا وَ مِـنْ سَيِّئات أعْمالِنا، مَنْ يَهْدِه اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هـادِيَ لَـهُ، وَ أشْـهَدُ أنْ لا إلـهَ إلا اللهُ وَحْدَهُ لا شَريكَ لَهُ، وَ أشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

(يَـا أَيُّهَـا الَّـذِينَ آمَنُـوا اتَّقُـوا اللَّـهَ حَـقَّ تُقَاتِـهِ وَلا تَمُـوتُنَّ إِلَّـا وَأَنْـتُمْ مُـسْلِمُونَ) (آل عمران:١٠٢)

(يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَـا وَبَـثَّ مِنْهُمَـا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّـهَ الَّـذِي تَـسَاءَلُونَ بِـهِ وَالْأَرْحَـامَ إِنَّ اللَّـهَ كَـانَ عَلَـيْكُمْ رَقِيبـاً) (النساء:١)

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُـوا اتَّقُـوا اللَّـهَ وَقُولُـوا قَـوْلاً سَـدِيداً يُـصْلِحْ لَكُـمْ أَعْمَـالَكُمْ وَيَغْفِـرْ لَكُـمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزاً عَظِيماً) (الأحزاب:٧٠ –٧١).

أمَّا بعد: فـإن أصـدق الحـديث كتـاب الله وخـير الهـدي هـدي محمـد ﷺ وشـر الأمـور محدثاتها، وكل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار.

پاشان: زانستی ئوصـوڵی فیقهـ، وەك گرنگترینـی زانـستە ئیـسلامییەكان لـەمڕۆدا، سـەرەتای دەركـەوتنی هاوتـا نییـە، لـە گـەڵ سـەرەتای هـاتنی ئیـسلام، و زۆرینـەی زانستەكانی تردا، ئەم لەو زانستانەیە كە لە دوا سـاتەكانی سـەدەی دووەمـی كۆچـیدا، ناوی هاتە ناو ناوان، و لە سەر دەستی ئیمامی شافیعی ( تێكرا بێـت، یـاخود لـە سـەر ئاستی مەزهەب)، بە سـەربەخۆیی بـە جیهـانی زانـستە ئیـسلامییەكان ئاشـنابوو، و تـا دواجار لە سەر دەستی ئیمامی شاطبی، و لە (الموافقات )دا، گەیشتە ترۆپك.

ئـەمڕۆ كـە سـەدان لێكۆڵینـەوە، و ماسـتەرنامە، و دكتـۆرا، تایبـەت لـەم بـوارەدا دەنووسرێت، ئاستی نرخ و بایەخ و مەزنی ئەم زانستە پیرۆزە دەردەخات.

ئەگەر چی زانایانی کوردیش، بە زمانی عەرەبی لەم بوارەدا زۆر داهێنەر، و بە توانا بوون، هەر لە (أبن الحاجب)، تا (ئامێدی)، و( مەلا موحەممەدی جەلی زادەی کۆیی)، و دەیانی تر، کە بە بەرگی کوردی، بەلآم بە زمانی عەرەبی، ڕێگا تاریك و تەسکەکانی ئەم زانستەیان بۆ تامەزرۆیانی زانست لە جیهانی ئیسلامیدا ڕووناك کردۆتەوە، و سوپاس بۆ خوا ئێستاش وورده وورده بە زمانی کوردی، خەریکە وەرگێڕان، و شەرح، و لێکدانەوە، و نووسین، و وەرگێڕان، دەکەوێتە کتێبخانەی کوردییەوە، و تامەزرۆیانی زانستی لە کوردستاندا پێی بەهرەمەند دەبێت.

بۆیە منیش وەك خزمەتێك بە قوتابیانی زانستی شەرعی لە کوردستاندا، بە بیرمدا هات، کە لەم بوارەدا، خزمەتێکی گچکە پێشکەش بکەم، بە هیوای ئەوەی کە جێی خۆی بگرێت، و خوای گەورە فەقێ، و قوتابیانی زانستی شەرعیی پێ بەهرەمەند بکات.

سەرەتا کەمێك دەبێت بگەڕێمەوە دوواوە، و ئەوە باس بکەم، کە ئەم هۆنراوەیەی (عمدة الطلاب)، بۆ یەکەم جار لە ساڵی (١٩٩٩) لە ماڵی مامۆستا شێخ ماجیدی ئامۆزام[١]، لە شارۆچکەی (کانی دینار)ـی، سەر بە شاری (مەریوان)ـی، ڕۆژهەلاتی کوردستان بینیم، کە لە دوو توێی نامیلکەیەکی بچووکدا چاپ کرابوو، لە گەڵ خۆمدا هێنامەوە، بۆ کوردستانی عێراق، و زەمەنێکی زۆر لە کتێبخانەکەمدا مایەوە، تا خودای گەورە لە (٢٢-٣-٢٠١٠) سەرکەوتووی کردم، کە بیر لە (شەرح)کردنی، بە کوردیی بکەمەوە، و دەستمپێکرد، و لە (١٠-٥-٢٠١٠)، پشت بە خودای گەورە تەواوم کرد.

---

١ مامۆستا مەلا ماجید، کوڕی خوالێخۆشبوو، مامۆستا شێخ زاهیدی، کوڕی مەلا شێخ موحەممەدی باراماوا، کوڕی شێخ عەبدوڵلای دەمەیەوی، لە هەورامانی کوردستانی ئێران، کە ئەگەر چی ئێستا وەك پیشە لەو بوارەدا کار ناکات، بەلآم مامۆستایەکی خوێندەوار و زانایە، و لە گەڵ ڕاڤیاری کوردیی ئەم پەڕاوەدا ئامۆزایە.

ئومێدەوارم خودای پەروەردگار، بە هۆی ئەم پەڕاوەوە فەقێ، و خوێندکاران، و تامەزرۆیانی زانستی شەرعیی کورد، لە هەر جێگایەك هەن، پێی سوودمەند بکات، منیش لە دووعای خێر بێبەش نەکەن، و ئەوەی من نووسیومە، ئەگەر پێکابێتم، لە خودای گەورەوەیە، و ئەگەر هەڵەشم کردبێت، لە خۆمەوەیە، و ئومێدەوارم هەڵەکان لە خزمەت مامۆستایاندا ئیصلاح بکەن، و ئیتر هەر بە تەمای دووعای خێر ..........

**باوکی نامی**

**عەبدوڵڵا مەلا ئەحمەد، ئەحمەدئاوایی**

٢١ی جماد الثاني ١٤٣١ * ٤ – ٦ – ٢٠١٠

**خورماڵ – هەورامان – کوردستانی عێراق**

# چمکێك لە ژیان و کەسایەتی
# ﴿الشيخ عباس بن السيد رضوان المدني الشافعي﴾
## دانەری هۆنراوەی (عمدة الطلاب)، لە زانستی ئوصولی فیقهدا

ئەم زانا پایەبەرزە، ناوی (عەبباسی، کوڕی موحەممەدی، کوڕی ئەحمەدی کوڕی سەیید ڕیضوان)ـە، و دواجار بە (مەدینەیی شافیعی) نیسبەتی لێدراوە، و لە ساڵی (١٢٩٣)ـی، کۆچی، بەرامبەر بە (١٨٧٧)ـی، زایینی، لە خانەوادەیەکی زانستیی، و ئایینی چاوی بە ژیان هەڵهێناوە، و ڕەچەڵەکیان دەچێتەوە سەر ﴿ئیمام حەسەنی کوڕی ئیمامی عەلی﴾، (ڕەزای خوای لێ بێت)، ئەم بنەماڵە زانستیی و ئایینییە، ناویان لە ریزبەندی ئەو زانایانەدا هەیە، کە لە درێژایی مێژوودا خزمەتیان بە (مسجد الحرام)، و (مزگەوتی پێغەمبەر) "صلى الله عليه، وعلى آله، وصحبه، وسلم"، کردووە، باپیرە گەورەیان، واتە: (سەیید ریضوانی ئەزهەری) لە میسرەوە هیجرەتی کردووە، بۆ (بیلادی حەرەمەین)، و لەو سەردەمەدا (موحەممەد عەلی پاشا) پێشوازی لێ کردووەو، ناردوویەتی بۆشاری مەدینەی پیرۆز، و کردوویەتییە مودەڕیسی مەدرەسەی مزگەوتی پێغەمبەر ("صلى الله عليه، وعلى آله، وصحبه، وسلم")، و خۆی و چەندەها زانای تر پێکەوە لەو زانستگا پیرۆزەدا خزمەتی زانستی شەرعییان کردووە، کە پێشتر ئەم سەیید ریضوانە مامۆستای زانکۆی ئەزهەر بووە، و دوای ئەویش وانە بێژ و مامۆستای مزگەوتی پێغەمبەر ("صلى الله عليه، وعلى آله، وصحبه، وسلم")، بووە، تا کاتی وەفاتکردنی لە ساڵی (١٢٥٥)ـی، کۆچی، و هەر لەوێ و لە گۆڕستانی (بەقیع) نێژراوە.

هەروەها باوکی ئەم شێخ (عەبباس)ـی، دانەری (عمدة الطلاب)، کە ناوی (شێخ موحەممەد) بووە، کە لە دایك بووی ساڵی (١٢٥٢)ی کۆچییە، ئەمیش پێش نوێژ، و سەر ئەڵقەی زیکر بووە، لە مزگەوتی پێغەمبەردا ("صلى الله عليه، وعلى آله،

وصحبه، وسلم")، و فەرموودەی پیرۆزی لە زانا گەلێکی، وەك: (الشيخ عبدالغني الدهلوی)، و (الشيخ عبدالحميد الشيرواني)، و (الشيخ شمس محمد أبو خضير)، و (الشيخ الدمياطي)، و (الشيخ أحمد أبو الخير المكي) و هی تریش،... وەرگرتووە.

دواتریش ئەم شێخ (موحەممەد)ــی، باوکی (شێخ عەبباس)ــی، دانەری (عمدة الطلاب)ــە، لە تەمەنی پێگەیشتندا بووەتە وانەبێژ لە مزگەوتی پێغەمبەری خوادا("صلی الله علیه، وعلی آله، وصحبه، وسلم")، و تا دواجار لە ساڵی (١٣١٣)ــی، کۆچیدا، وەفاتی کردووە.

هەروەها جگە لە باپیری و باوکی، یەکێکی تر لە زانا پایەبەرزەکانی ئەم خانەوادەی (سەیید ریضوانە)، بریتییە لە: (السيد عبدالباري رضوان)، کە ئەمیش وانە بێژی (مسجد الحرام) بووە، و هەروەها (الشيخ عبدالمحسن رضوان)، کە برای (شێخ عەبباس)ــە، ئەمیش زانایەکی پایەبەرز بووە، کە لە دایکبووی ساڵی (١٢٩٢)ی کۆچییە، کە لە دوای لەبەر کردنی قورئانی پیرۆز، و خوێندنی زانستە شەرعییە سەرەتاییەکان، و مام ناوەندەکان، زانستی تەواوی لە زانا گەلێکی وەك: (باوکی خۆی)، و (السيد أحمد بن إسماعيل البرزنجي)، و (الشيخ عبدالجليل برَّادة)، و (السيد علي بن ظاهر الوتري)، و (السيد محمد بن جعفر الكتاني)، و (الشيخ فالح محمد الظاهري)، و هی تریش.... وەرگرتووە، و هەروەها ئەمیش شەرەفی بوونە مودەڕیسی مزگەوتی پێغەمبەری، ("صلی الله علیه، وعلی آله، وصحبه، وسلم")، بە نسیب بووە.

ئینجا با بچینەوە سەر باسی (شێخ عەبباس المدني الشافعي)، کە مەبەستەکەمانە، ئەم زانا مەزنە دوای لەبەر کردنی قورئانی پیرۆز، زانستی لەسەر دەستی باوکی و (الشيخ عبدالغني الدهلوی) وەرگرتووە، کە زیاتر فەرموودەی لە (الشيخ عبدالغني) وەرگرتووە، و فێر بووە، و لەبەرکردووە، و دواتر لە مزگەوتی پێغەمبەردا("صلی الله علیه، وعلی آله، وصحبه، وسلم")،دەرسی لە خزمەتی عەللامە (السيد أحمد بن

إسماعیل البرزنجی) خوێندووە، کە موفتی شافیعی بووە لە مەدینەدا، و لەم زانایە زیاتر فیقهی وەرگرتووە، و هەروەها نەحو، و سیرەشی لە لا خوێندووە.

هەروەها لە لای (الشیخ فالح الظاهري)، نەحو، صەرف و فەرموودەی خوێندووە، و دواتر ئەدەبی عەرەبی لەلای (الشیخ عبدالجلیل برَّادة)، خوێندووە، و زانستەکان، و زاراوەکانی فەرموودەی لەلای (الشیخ محمد بن جعفر الکتانی) خوێندووە، و هەروەها لە خزمەتی ئەم زانا پایەبەرزانەی تریشدا زانستە جۆر بەجۆرەکانی درێژە پێداوە، و خوێندووە، لەوانە: (الشیخ علی بن ظاهر الوتری)، و (الشیخ عبدالرحمن أبو خضیر)، و (الشیخ أحمد الشنقیطي)، و (الشیخ عثمان بن عبدالسلام الداغستانی)، و (الشیخ أحمد الجزائري)، و (الشیخ حسین محمد الحبشي)، و (الشیخ محمد سلیمان حسب الله)، و (الشیخ عبدالحق الألهابادي)، و (الشیخ حسین بن محمد الجسر الطرابلسي)، و هی تریش... کە لە هەر دوو مزگەوتی حەرەمەینی شەریفەیندا، لە خزمەت ئەم زانا گەلەدا سوودمەند بووە.

دوای دەستخستنی زانست، و دەرکەوتنی ئەم زانا مەزنە، وەك لێزانێکی زەبر بەدەست، و خاوەن بەڵگەی ڕۆشن، فەرمانی پێکرا، کە ببێتە وانە بێژی مزگەوتی پێغەمبەر("صلی الله علیه، وعلی آله، وصحبه، وسلم")، و دەرس بە فەقێ، و قوتابییان بڵێتەوە، و هەر لە هەمان کاتدا لەگەڵ (الشیخ محمد طیب الأنصاری)، لە تەنیشت ئەم زانا بەرزەوە، و پێکەوە وانەیان دەگوتەوە، و خزمەتیان بە زانست، و قوتابیانی شەریعەت دەکرد، شایەنی باسە شێخ عەبباس، زیاتر وانەکانی فەرموودە، و فیقهی شافیعی، و ئوصولی فیقهـ، و صەرف، و نەحوی تەدریس دەکرد، و لەو قوتابییانەی لەو کاتەدا، و لە خزمەت ئەم زانا مەزنەدا دەرسیان دەخوێند، و چۆکی فەقێیەتیان دادابوو، ژمارەیەکی زۆر و بێ شومار بوون، لەوانە: (الشیخ عبدالقدوس الانصاری)، و (الشیخ محمد عیسی الفادانی) و (حاجی موحەممەد ئەنکۆتیم)، و ژمارەیەکی تر، لە

قوتابیانی زیرەك، و ژیکەڵــە، کــە دواتــر بوونــە زانــا، و بــانگخوازی مــەزنی جیهــانی ئیسلامیی.

شایەنی باسە، (شێخ عەبباس ڕیضوانی مەدینەیی)، پاش هەڵایـسانی جـەنگی جیهـانی یەکەم، بە ناچـاری ڕووی کـردە میـسر، و دواتـر چـاوی بـە زانایـان، و مامۆسـتایانی زانکۆی ئەزهەر کەوت، و داوایان لێ کرد، لەوێ وانە بڵێتەوە، و ئـەویش بـۆ مـاوەی چەند ساڵێك، بەو ئەرکـە شـەرعییە هەسـتا، و بڕیـاری مانـەوەی لـە میـسردا، بـەڵام خۆشەویستی و سۆزی شار و مزگەوتەکـەی پێغەمبـەر("صـلی الله علیـە، وعلـی آلـە، وصحبە، وسلم")، هەڵی پێچا، و سەر لـە نوێ گەڕایەوە بۆ مەدینـە، و لـەم بارەیـەوە هۆنراوەیەکی جوانی نووسیوە، کە لـە هەندێکیدا سەبارەت بە خۆشەویستی خـۆی، بـۆ ئەو شارە، و سۆزی تایبەتی بۆ پێغەمبەری خوا("صلی الله علیە، وعلـی آلـە، وصـحبە، وسلم")، فەرموویەتی:

لقرص شعير، تــــافـــــــل غير مالح  
بغير إدام، والـــــــذي يسمع النجوى  
مـــــــع الفـقر، في دار الحبيب محمد  
ألذ على قلبـي، مــــن المَنِّ والسَّلوى  
عـلـــى إنني، فيهــا عــــلى كحالة  
غنى يتيسر الأمــور، كـــــمـــا أهوى

دواتر، و پاش کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانیی، گەڕایەوە مەدینــە، و دەسـتی کردەوە، بە وانە گوتنەوە، تا کاتی وەفاتکردنی.

## کتێبەکانی:

(١). فتح رب الأرباب بما أهمل في لب الألباب " لە بەرواری (٣٠ جمادى الأولى سنة ١٣٤٥ هـ)، تەواوی کردووە.

(٢). كتاب فرائد العقود الدرية ": دەربارەی ژیانی (فاطمة الزهراء والحسن وعلي وزين العابدين ومحمد الباقر وجعفر الصادق والعباس عم رسول الله صلى الله عليه وسلم)، نووسیویەتی، و لە بەرواری (٢٧ جمادى الآخرة سنة ١٣٤١ هـ)، تەواوی کردووە.

(٣).أعلام الناس بأسانيد السيد عباس.

(٤).العقد الفريد في المنظوم مما تناثر من فرائد جواهر الأسانيد.

(٥). فتح البر بشرح بلوغ الوطر من مصطلح أهل الأثر .

(٦). اتحاف الإخوان بشرح قصيدة الصبان في المصطلح.

(٧). عمدة الطلاب في أصول الفقه .ئەم بەرهەمەی بەردەستمان.

(٨).كفاية الطلاب، لە زانستی میراتدا.

(٩). إرشاد الأحباب إلى أسرار كفاية الطلاب.

(١٠).القطر الشهدي، في أوصاف المهدي .

شایەنی باسە ئەم کتێبانەی لەو سەردەمە سەختەدا کە کاری چاپ و بڵاوکردنەوە، زۆر گرفتاوی بوو، چاپ دەکرد، و بێ بەرامبەر، و بە خۆڕایی دابەشی دەکردن، بە سەر فەقێ، و تامەزرۆیانی زانستەکانی شەریعەتدا.

**کۆچی دوایی**: دواجار، و پاش خزمەتێکی زۆر بە زانست، و زانایان، و مزگەوتەکەی پێغەمبەر، ("صلى الله عليه، وعلى آله، وصحبه، وسلم")، ئەم زانا مەزنە، لە شەوی هەژدەی ڕەمەزانی (١٣٤٦)ی، کۆچی، بەرامبەر بە ساڵی (١٩٢٨)ی، زایینی، کۆچی دوایی کرد، و لە مزگەوتی پێغەمبەردا ("صلى الله عليه،

وعلى آله، وصحبه، وسلم")، نوێژی لە سەر کرا، و لە گۆڕستانی ﴿بەقیع﴾، ئەسپەردە کرا.

تَغَمَّدَهُ اللهُ تعالى، وَ رَحِمَهُ، جَزاءَ مَا أَسْدى لِلْعِلْمِ، وَأَهْلِهِ.

**سەرچاوە:**

- أعلام من أرض النبوة، أنس يعقوب، بەرگی دووەم، لاپەڕە ١١٣ – ١١٧ چاپی یەکەم، ١٩٩٥.

## ﴿مێژوی زانستی ئوصولی فیقه﴾ [٢]

ئوصولی فیقه گرنگترین و بە سوود ترینی زانستە ئیسلامییەکانە، و مەبەست پێی بە دەستهێنانی حوکمە شەرعییەکانە لە بەڵگە شەرعییەکانەوە.

ئەو حوکمانەی کە لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺبە بێ هیچ ئامرازێك لە قورئان و فەرموودەکان و کار وکرداری پێغەمبەرەوەﷺوەرگیراون، و لەبەر ئەوەی کە قورئان بە زمانی عەرەبی خۆیان نازڵ دەبوو، هۆکاری هاتنەخوارەوەی ئایەتەکانیان ئەزانی پێویستیان بە زانستی تر نەبوو، بۆ هەڵهێنجانی حوکمەکان

تەنانەت ئەمەش بیستراوە لە مێژوونووسانی ئیسلام کە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ لە تێگەیشتن لە قورئان، و وەرگرتنی حوکم لێیەوە پێویستسان بەوە نەبووە، بگەڕێنەوە بۆ پێغەمبەرﷺ و ڕاستەوخۆ خۆیان زانیویانە کە قورئان چی دەفەرموێت، و پێغەمبەریشﷺچۆن پەیڕەویی لێوە دەکات، بەو شێوازە ئەوانیش جێ بەجێ یان کردووە، هەروەها عەرەبی بوونی زمانی پێغەمبەر ﷺ و فەرمودەکانی هۆکار بووە، بۆ ئاسان تێگەیشتنیان لە قورئان و ئەحکامە شەرعییەکان، کار و کرداری پێغەمبەرﷺ هاوکاری باشیان بووە، بۆ ئیسلام ناسین بە شێوازێکی دروست، بۆیە لە کارو کردەوەی عیبادەتیی و مامەڵە سیاسییەکاندا ژیرانە جوڵاونەتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا لە نێوان هاوەڵانداﷺ تەنها چینێك کاریان تایبەت بووە بە فەتوا و دەرهێنانی حوکمی شەرعی و قسەکردن لەسەر قوڵاییەکانی ئیسلام ناسی، کە بە پلەی یەکەم خەلیفەکانی ڕاشیدینﷺ و دوای ئەوانیش کەسانێکی بەتوانا و زاناو دانا و ژیری، وەك عبدالرحمن ی کوڕی عەوف، و ئوبەی کوڕی کەعب، و عبداللە ی کوڕی مەسعود، و موعازی کوڕی جەبەل، و عەمماری کوڕی یاسر، و حوزەیفەو زەیدی کوڕی سابت، و ئەبو دەرداء، وئەبوو موسای ئەشعەریﷺو ئەوانە بوون، کە کاروباری

٢ . أصول فقه امام شافعي، " فارسي"، أبو الوفا محمد بن عبدالكريم كانيمشكاني، ناسراو بە (موعتەمەدی کوردستانی)، چاپی سنە ، ٢٠٠٤.

شەرعییان بۆ خەڵكی ڕون دەكردەوە، بە گوێرەی قورئان و فەرموودە، و هەر شتێكیش ئەگەر لە قورئان و فەرموودەدا نەبوایە، ئەوا بە گوێرەی ئیجتیهاد و ڕای خۆیان بڕیاریان دەدا، و فەتوای شەرعیان لە سەری دەردەكرد، ئەم چینە زانایەش لەبەر ئەوە كە جێی بڕوا و بایەخی پێغەمبەر ﷺ و ئومەتی ئیسلامی بوون، و دوای پێغەمبەر ﷺ ئیجماع و كۆڕای ئەوان لە سەر حوكمیە شەرعییەكان و هەروەها كۆبوونەوەی موجتەهیدەكانی ئوممەتی ئیسلام، دوای ئەوان بە كۆڕایی لە سەر هەر حوكمێكی شەرعی بە یەكێك لە بەڵگە شەرعیەكان هاتە ئەژمار، و بە ڕیزبەندی قورئان، سوننەت، ئیجماع، قیاس، ڕیزكران.

ئیجتیهادكردن سەبارەت بە حوكمیە شەرعییەكان، هەر لە سەردەمی پێغەمبەرەوە ﷺ دەستی پێكرد، بەڵام لە بەر ئەوەی كە لەو كاتەدا پێغەمبەر ﷺ خۆی لە ژیاندا بووە، كەمتر پێویستیان بە ئیجتهادكردن بووە، ڕاستەوخۆ لە سەرچاوە زوڵاڵەكەی پێغەمبەرەوە ﷺ لە ئیسلام حاڵی دەبوون، بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا هەندێ گێڕانەوە هەن، كە ئاماژەن بۆ ئیجتیهادكردنی هاوەڵان ﷺ سەبارەت بە حوكمە شەرعییەكان، وەك بوخاری و موسلیم دەگێڕنەوە كە لە كاتی شەڕی سەر جوولەكەكانی (بەنی قوڕەیزە)دا، سەعدی كوڕی مەعاز سەبارەت بە شەڕەكە فەرمووی : (نقاتل مقاتلهم و نَسبي ذُريتهم) لەوكاتەدا پێغەمبەر ﷺ ئەم ئیجتیهاد و بڕیارەی موعازی پەسەند كرد، و فەرمووی: (حكمت عليهم بحكم الله)، هەر وەك، لە (جمع الجوامع) و (لبّ الاصول) دا باسكراوە.

هەروەها لەكاتی بەڕێكردنی موعازی كوڕی جەبەلدا بەرەو یەمەن پێغەمبەر ﷺ بۆ تاقیكردنەوەی موعاز ﷺ فەرمووی: لە كاتی هەڵسوڕاندنی كاروباری مسوڵمانانندا بە چی حوكم دەكەیت؟ ئەویش فەرمووی: بە قورئانی پیرۆز، ئینجا ئەی ئەگەر لە قورئاندا نەبوو ؟ موعاز ووتی: لە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ دا، فەرمووی: ئەی ئەگەر لە سوننەتیشدا نەبوو ؟ موعاز ووتی: بە گوێرەی ڕەئی و ئیجتیهادی خۆم! لێرەدا

پێغەمبەرﷺکە زانی موعازﷺلە تاقیکردنەوەکەدا دەرچوو، سوپاسی خوای کرد، لە سەر ئەوەی نوێنەرەکەی کەسێکی ژیرو بە ئاگایە، و لە سەر ئەو ڕەوتە کار دەکات و دەڕوات، کە خودا و پێغەمبەرەکەیﷺ پێی ڕازین، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە شەرع ڕێگەو بایەخی داوە بە بەکارهێنانی ڕێبازی ڕا وەرگرتن و ئیجتیهاد لە شەرعدا، لە دوای پێغەمبەرﷺ لەبەر ئەوەی کە دەرگای وەحی داخراو ڕەوشێکی تازە هاتە ئاراوە، کە جۆرەها ڕاو بۆچوون و ڕووداوی جیا دروست دەبوون کە لە قورئان و سوننەتدا باس نەکرابوون، هەروەها خەڵکێکی زیاتریش هاتنە ناو بازنەی ئیسلامەوە و سنوری قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی ئیسلامیش زیادی کرد، بۆیە ڕیگای ئیجتیهاد لێرەوە زیاتر کرایەوە و بایەخی پێدرا، بە تایبەتی لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدینﷺو زانایانی سەردەمی سەرەتای ئیسلام، کە ئیجتیهادیان لە کاروبارەکانیاندا دەکرد، و هەروەها فەرمانیان بە زانایان و دەسەڵاتداران و ژێردەستیان دەکرد، کە ئیجتیهاد بکەن، هەروەك لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا بە ڕوونی ئەم حاڵەتە دەردەکەوێت:

١- لە سەردەمی خەلافەتی ئیمامی ئەبوبەکرداﷺهۆزگەلێك لەبەنی حەنیفە،و هی تریش بڕیاریاندا کەزەکات نەدەن بە خەلیفەی موسڵمانان بە بیانووی ئەوەی کەزەکات تایبەت بووە بە خودی پێغەمبەرەوەﷺلە سەر ئەم هەڵوێستەیان خەلیفە ئەبوبەکرﷺهەستا بەشەڕ لەگەڵ کردنیان ئەمە لە کاتێکدا کە عومەری کوڕی خەتابﷺڕخنەی لێگرت، و فەرمووی پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی:(أمرت ان أقاتل الناس حتى يقول لا الـه الا الله و اذ قالواهـا عـصموا منـى دمـاءهم) بۆیە ئیمامی ئەبوبەکرﷺفەرمووی:(الم يقل بحقها، فمن حقها ايتـاء الزكـاة، كما ان من حقها اقـام الصلاة، فما أفرق بين ماجمع الله، ولله لو منعونى عناقـا، ممـا اعطـوا النبـىﷺلقـاتلتهم عليـه!) ئیتر لێرەوە پێشەوا عومەری کوڕی خەتابﷺو هاوەڵانی دیکەﷺبەم بەڵگەیەی ئیمامی ئەبوبەکرﷺ ڕازی بوون، و بڕوایان کرد، لەم ئیجتیهاد و هەڵهێنجانی حوکمەوە دوو ئاراستە لە بڕیارەکەی ئیمامی ئەبوبکرداﷺڕون دەبێتەوە:

یەکەمیان: ئەوەیە کە گشتگیری ئەم فەرموودەیە دەر دەخات کە ئیمامی عومەرﷺکردی بە بەلگە.

دووەمیشیان: سەلماندنی خەلیفایەتی بوو، لە لایەن ئەبوبەکرەوەﷺکە خۆی بەجێنشینی ڕاست، و دروستی پێغەمبەرﷺدەزانێت و خۆیشی بەشایەنی ئەوە دادەنێت لە جێی ئەو بڕیار بدات، و هەستێت بە کۆکردنەوەی زەکات لە سامان داران و دابەشکردنی بەسەر بێنەوا، و هەژاراندا.

٢- خەلیفەی دووەم ئیمامی عومەری کوڕی خەتابﷺلەو پەیامەیدا کە ئاڕاستەی (أبو موسى الاشعری) کردووە، کە لە چوار چێوەی ڕاڤەکردنی شێوازی حوکم، و قەزاوەت لە نێو موسڵماناندا هەستا بە دیاریکردنی پێگەی ئیجتیهاد لەو جێگایانەدا کە دەقی ڕاستەوخۆی لەسەر نەهاتووە، وەك دەفەرموێت: (فان القضاء....) لێرەدا ئیمامی عومەرﷺشێواز و پلەی ئیجتیهاد و هەڵهێنجانی حوکمەکانی بە باشترین ڕێباز داناوە، کە کەسانی ژیرو عاقڵ بە کاری دەهێنن، و کاری لەسەر دەکەن، بڕیاریشیداوە کە وەك ئامرازێك بۆ قەزاوەت بەکار بهێنرێت.

٣- بەگوێرەی ئەوەی کە دەیگێڕنەوە کە (قدامة بن مظعون)کە لە هاوەڵانیﷺ پێغەمبەرﷺبوو، عارەقی خواردەوە لە سەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەتابداﷺلەم سەرووبەندەدا پێشەوا عومەرﷺلێی پرسی، بۆچی ئەم تاوانەت کردووە؟ ئەویش ووتی: خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوا إِذَا مَا اتَّقَوْا وَآمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ ثُمَّ اتَّقَوْا وَآمَنُوا ثُمَّ اتَّقَوْا وَأَحْسَنُوا وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ(٩٣)المائدة﴾ و من لە کۆچ کردووانی سەرەتای ئیسلامم، و بەشداری شەڕەکانی بەدر و ئوحودم کردووە، و پێشەوا عومەرﷺداوای لە ئامادەبووان کرد، کە وەڵامی بدەنەوە، خەڵکی سەراپا بێدەنگیان لێکرد، و دواتر فەرمووی: بە (عباسﷺ) کە وەڵامی بداتەوە، ئەویش فەرمووی: ئەم ئایەتە دەربارەی کەسانێك هاتووە، کە پێش بە یەکجاری حەرامکردنی مەی، و نازڵبوونی ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ

آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالأنصَابُ وَالأَزْلاَمُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ(٩٠)المائدة.............﴾ ئەو گوناحەیان کردووە، بۆیە پێشەوا عومەرﷺ بە ڕاوێژ لەگەڵ ئامادەبووان و شارەزایان داوای دیاریکردنی سزای کەسی عارەق خۆری لێکردن، و لێرەدا پێشەوا عەلیﷺکوڕی ئەبوتاڵب فەرمووی:(من شرب هذى، ومن هذى أفترى، فأرى عليه حد المفترى) کە لەکاتی ڕاجیایی هاوەڵانداﷺلە سەر سزاکە کە هەندێکیان بە هەشتا دار، و هەندێکیان بە چل دار، دایان نابوو، لێرەدا پێشەوا عەلیﷺهات، ڕاو ئیجتیهادی خۆی لەو بارەیەوە فەرموو، بەوەی کە مەی نۆشە، چونکە بەو کردەوەیەی عەقڵ لە دەست دەدات، و وڕێنە دەکات، و پاشان درۆ و دەلەسە بە دەمیدا دێت، و بوختان و قسەی نابەجێ ڕووبەڕووی کۆمەڵگا دەکاتەوە، لێرەدا کارەکەی قیاس کردە سەر سزای (بوختان چی)، و هەردووکیانی وادانا، کە دەبێت یەك سزایان هەبێت، و هەروەها لە بوارەکانی میرات دا ئیجتیهادی ئەم پێشەوایە ڕوون و دیارن.

٤- عەبدوڵلای کوڕی مەسعودﷺبە کەسانێك کە پلەی قەزاوەت و دادگایان بدرایەتە دەست دەیفەرموو: (الأمر في القضاء بالكتاب و السنة و قضايا الصالحين ، فأن لم يكن شيئ من ذلك فاجتهد برأيك)، هەر بەم شێوازەش هاوەڵانی دیکەﷺ، و موجتەهیدەکانی سەرەتای ئیسلام، لە قەزاوەت و کارو باری دادگادا بڕیاریان لە سەر ئیجتیهاد و ڕەئیگیری دەدا، لەو شتانەدا کە دەقی قورئان و فەرموودە، و ڕای ئیجماعی لەسەر نەبوایە.

دوای بەسەر چوونی کات و ژیانی هاوەڵە فەقیهەﷺ، و زاناو شەرعزانەکان، سەردەمی (تابعين) هاتە پێشەوە، ئەوانەی کە چاویان بە هاوەڵانﷺکەوتبوو، و زانستیان لێوەر گرتبوون، کە لە ناویاندا حەوت کەس زۆر ناسراو، و زانا بوون، کە ئەو حەوت کەسەش لە(مەدینە)دا بوون، و بە حەوت شەرعزانە مەزنەکە، (فقهاء سبعة)

ناسرابوون، کە ژمارەیەك لە زانایان ئەو حەوت کەسەیان لەم دوو بەیتە شیعرەدا ناو هێناوە:

ألا كـــل مـــــن لا يقتــــدي بــــأئمة

فــــقسمته ضيزى، عــــن الحق خـــارجة

فــــخذهم عبيدالله، عـــــروة، قــــاسم

ســـعيد، سليمـــان، أبــــوبكر، خارجـــة

دوای بەربڵاوبوونی قەڵەمڕەوی خیلافەت و گەیشتن بە عێراق و نەشونماکردنی کۆمەڵگای ئیسلامی بە شێوەیەکی بەرفراوان و بێ وێنەو تێکەڵبوونی جۆرەها نەتەوەو، خەڵکانی جۆراوجۆر بە ئیسلام، و ناوچەکانی خیلافەت و بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباریان بازنەی ئیجتیهاد و ڕادەربڕین زیادی کرد، بە تایبەتی لە عێراقدا، و بۆیە زانایانی عێراق زیاتر بە ئەهلی ڕەئی ناویان دەرکرد، و ئەم ڕەوشتە لەسەردەمی پێشەوا ئەبو حەنیفەدا گەیشتە ترۆپك، بەڵام زانایانی مەدینە لە بەر ئەوەی کە لە ناو چەقی دەسەڵاتی ئیسلامیدابوون، و کەمتر قەڵەمڕەوەکەیان تێکەڵاوی غەیرە عەرەبی دەکرد، و زۆر کاروباری جۆراو جۆریان ڕووبەڕوو نەدەبوویەوە، زیاتر وابەستەبوون بە سوننەتەکانو فەرموودەی پێغەمبەرەوە ﷺ و کەمتر خۆیان لە ڕادەربڕین و ئیجتیهاد دەدا، و ئەم ڕەوشتە لەسەردەمی پێشەوا مالیکی کوڕی ئەنەسدا گەیشتە ترۆپکی گەشەسەندن، و لەم نێوەندەشدا ڕەوتی پێشەوا موحەممەدی کوڕی ئیدریسی شافیعی دەرکەوت، کە پێشتر لەشاری مەدینەدا، و لەخزمەت پێشەوا مالیکی کوڕی ئەنەسدا خوێندبووی، و دواتر ڕووی لە عێراق کردبوو، لێرەش تێکەڵاوی ئەبوحەنیفە، و هاوەڵانی کردبوون، و سودی لێوەرگرتبوون، بۆیە هەر دوو مەدرەسەی سوننەتخوازی مەدینەو ڕادەربڕی عێراقی لێکدا لە مەزهەبێکی سەر بەخۆدا کۆی کردنەوە، و دواتریش مەزهەبی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەرکەوت، کە یەکێك بوو، لە گەورە زانایانی فەرموودەناسی و هاوەڵی ئیمامی شافیعی بوو، بۆیە پەیڕەوانی ئەم ئیمامە کە زۆر

شارەزابون لە فەرموودەدا جیا لە ئەبوحەنیفە و ئەوانی تر، هەستان مەزهەبێکی نوێیان ڕاگەیاند، کە دواتر بە مەزهەبی (حەنبەلی) ناوی دەرکرد، لە گەڵ ئەم سەربەخۆییەشدا ئیمام ئەحمەد ڕای لەسەر ئیمام شافیعی زۆر باش بوو، بە جۆرێك ئەم دوو بەیتە شیعرەی لێدەگێڕنەوە، کە لە گەورەیی شافیعی و مەزهەبەکەیدا ووتونی:

ان المـــــذاهب خـــــــيرها و أجلّـــــــها
مـــــا أختـــاره الحبر الأمام الشافـــــعی
أخترتُ مذهبــــــــه، و قلت بقــــــــوله
و جعلتــــــه يـــــوم القيامة، شـــــافعيِ!

بەم شێوازە دروستبوونی چوار مەزهەبەکە هاتە ئاراوە، هەر چەندە چەند مەزهەبێکی تری، وەك مەزهەبی پێشەوا داودی ظاهیری و موحەممەدی کوڕی، دەرکەوتن، کە تەنها باوەڕیان بە دەق و ئیجماع هەبوو، لە هەڵهێنجانی ئەحکامدا، و دژی ڕەئی و قیاس بوون، بەڵام زۆر درێژەیان نەکێشا، و مەزهەبەکانیان لە ناوچوون! وتەنها چوار مەزهەبەکەی (شافیعی و حەنبەلی و مالیکی و حەنەفی) مانەوە.

وەك پێشتر باسمانکرد، کە لە سەرەتای هاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا لە بەر ئەوەی کە هاوەڵانﷺو موجتەهیدینی ئیسلام عەرەبی زمان بوون، و شارەزای تەواوبوون لە دەربڕینی عەرەبیدا، و هەروەها بەئاگابون لە هۆکارەکانی نازڵبوونی قورئان، بۆیە زۆر پێویستیان بە هەندێ ووردەکاری و شارەزایی وورد لە زانستە ئالی یەکاندا نەبوو، بەڵام لە گەڵ بەسەرچوونی سەدەی یەکەمی کۆچی، و دەستپێکردنی سەدەی دووەم، و بەر فراوان بوونی قەڵەمڕەوی خیلافەتی ئیسلامی کێشە دروست بوو، کەسانێك کە زۆر شارەزا نەبوون لە زمانی عەرەبی و یاساکانی، و بە تەواوی

هاوەڵانیش ﷺ کۆتاییان هاتبوو، بۆیە پێویستیان بە هەندێ زانست هەبوو، تا چاکتر لە قورئان و ئیسلام حاڵی ببن، و لەم نێوەندەشدا کەسانێك پەیدابوون، کە هەریەکە و بە نیازێك هەڵدەستا بە دروستکردنی فەرموودەی جۆراو جۆر بە دەمی پێغەمبەرەوە ﷺ، بۆیە بۆ دروست حاڵی بوون لە مەفهومی ئەحکامەکانی قورئان، و جۆرێك خۆپاراستن لە فەرموودەی هەڵبەستراو، و لاواز چەند زانستێکی نوێ هاتنە ئاراوە، تا مەفهومی حوکمە شەرعیەکان لەڕوی (عموم و خصوص و مطلق و مقید و مجمل و مبهم و ناسخ و مسنوخ) و هی ترەوە دیاری بکەن، دواتریش جگە لەوانە بەڵگەی تری وەك:(أستحسان و أستصحاب)و هی تریش هاتنە ئاراوە، و لێکۆڵینەوەی چڕوپڕ لەم بارەیەوە دەستی پێکرد، کە تێکڕای ئەم ئامرازانە دواتر لە چوار چێوەیەکدا خۆیان بینییەوە، کە بە(الأصول الفقه) ناوزەدکرا، کە زانایانی ئیسلام بەهۆی ئەو زانستەوە توانیان و دەتوانن دروست لە مەفهومی حوکمە شەرعییەکان تێبگەن، بەڵام ئەم زانستی ئوصولی فیقهە هەرچەند بە شێوەی پچڕ پچڕو لە چەند فەصڵێکی تاك و تەرادا باسکراوە، لە لایەن زانایانی ترەوە، بەڵام پێشەوا موحەممەدی کوڕی ئیدریسی شافیعی تەنها کەسێکە لە قەوارەیەکی سەربەخۆدا پاراستی و ڕایگەیاند، ئەمەش ڕای زۆرینەی مێژوو نووسان و زانایانی ئایینی پیرۆزی ئیسلامە، کە کتێبی (الرسالة)ی لەو زانستە مەزنەدا نووسی، هەروەك پێشەوا فەخرەدینی ڕازی لە ڕاڤەی خەسڵەتە بەرزەکانی ئیمامی شافیعیدا، دانی بەم ڕاستیەدا ناوە، هەروەها لەم بارەیەوە مێژوونوسی گەورە (یاقوت الحموی) لە کتێبی (محجم الأدباء)دا، دەربارەی ڕاڤەی ژیانی ئیمامی شافیعی، و کتێبی (الرسالة) نووسیویەتی: کە عبدالرحمن ی کوڕی مەهدی داوای لە ئیمامی شافیعی کرد، (کە هێشتا لەسەردەمی گەنجیدا بوو)، کە کتێبێك بنووسێت، سەرجەم ماناکانی قورئان "باسی ناسخ و مەنسوخ و دروستی بە بەڵگەبونی ئیجماع و یاساو ڕێساکانی قورئان و فەرموودە" بگرێتەخۆ، بۆیە ئیمامی شافیعی هەستا بە نووسینی کتێبی (الرسالة)، لێرەوە دەردەکەوێت، کە ئیمامی شافیعی لە دانانی زانستی ئوصول

فیقهدا داهێنەر بووە، و تەنها کەسی دانەری کتێب و بە سەربەخۆ ناساندنی زانستی ئوصوڵی فیقهـ، ئەو پێشەوا مەزنە بووە، کە هەر لەو کتێبەیدا هەستا بە باسکردن و لێکۆڵینەوەی دەقە قورئانی و فەرمودەییەکان و باسی ناسخ و مەنسوخ و پلەکانی بە بەڵگەبونی فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺو ئیجماع و قیاس و ئیجتیهاد و ئیستیحسان و هی تریش.....

بەڵام لە گەڵ ئەمەشدا (د.عبدالکریم زەیدان)، نووسەری کتێبی (الوجیز فی أصول الفقه)، و (مامۆستا ئەبولوەفا موعتەمەدی کانیمشکانی سنەیی) لە کتێبی (أصول فقه امام شافیعی)دا، ئەوەیان درکاندووە، کە (شێخ مەحموود شەهابی خوراسانی) لە کتێبی (فوائد الاصول)دا، کە پەرتوکێکە، و تایبەت بۆ قوتابیانی زانکۆی تارانی نووسیوە، کە لەوێ مامۆستا بووە، و دواتر چاپی کردووە، بەناوی (فوائد الاصول)، هەرچەندە دانی بەوەدا هێناوە، کە ئیمام شافیعی داهێنەری یەکەمی زانستی ئوصوڵ بووە، بەڵام گومانی ئەوەشی دروست کردووە کە لەوانەیە (ئەبو یوسف) داهێنەری یەکەم بێت، سەبارەت بەوەی کە (شەهابی خوراسانی) سەلماندوویەتی، ئیمام شافیعی داهێنەری یەکەمە، هەستاوە بە هێنانی قسەی مێژوو ناسانی مەزن و ئیجماعی زانایانی ئیسلام، لەم بارەیەوە، بەڵام سەبارەت بەو گومانەی کە دواتر دروستی کردووە، کە گوایە پێش ئیمامی شافیعی خەڵکی تر قسەیان لەسەر ئوصوڵ کردووە، دوو بەڵگەی هێناوە، کە یەکەمیان ئەوەیە، کە لە کتێبی (الفهرست)ی (ابن ندیم)دا لە چوار چێوەی ناوی کتێبەکانی (محمد بن حسن شیبانی) ناوی کتێبی (الاصول الفقه)ی هێناوە، هەروەها کتێبی (اجتهاد الرأی)و (کتاب الاستحسان)یش، و دوەمیان بە بەڵگەی ئەوەی کە(ابن خلکان) لە ڕاڤەی بیۆگرافیای (ابویوسف)دا نووسیویەتی، کە یەکەم کەس بووە لە مەزهەبی حەنەفی دا هەستاوە بە دانانی زانستی ئوصوڵ فیقهـ! و هەروەها ئەوەشی پشت ڕاست کردۆتەوە، کە گوایە شافیعی چاوی بە (محمد بن حسن شیبانی) کەوتووە، ونوسخەی لە کتێبەکانی ئەو گرتۆتەوە، بەڵالام سەبارەت بە پەرچدانەوەی

ئەم ڕایانە لە گەڵ بوونی ئیجماعی زانایـان وقـسەی مێژونوسـان و زانایـانی سـەلەف، و ئەو قسانەی کە (یاقوت حموی)نووسیونی، ئەم قسە، و بەڵگانەی (مـەحمود شـەهابی) هیچ بنەمایەکیان نییـە، ئیحتیمـالی بـەهێز ئەوەیـە کـە مەبەسـت لـە نووسـینی کتێبـی (الاصول الفقه) و (الاجتهاد الرأی) و (کتاب الاستحسان) کە (ابن ندیم) لە چوار چێوەی کتێبەکانی (شەیبانی)دا ناوی هێنـاون، لەوانەیـە، وەك (بـەش)و (بـاس) نـاوی هێنـابن، نەك کتێبی سەر بەخۆ! چونکە لەو سەردەمەدا زانایانی شـەرع زان (فقیهــ) لـە کتێبـە فیقهیەکانیاندا باسی ئوصوڵیان لە چوارچێوەی فیقهدا دەکرد، هـەروەك لـە نـاو بردنـی ناوی کتێبەکانی تری (شەیبانی) دا هاتووە، (بەش)و(باس)ی بە کتێب ناوزەد کردووە، لە کاتێکدا کتێبی سەربەخۆ نین، و لە چوار چـێوەی کتێبـی تـر دان، کـە ئـەم کـارەش کاتی خۆی زۆر بووە، هەر وەك تا ئێستاش لـە کتێبـە فیقهییەکانـدا نـاوی لـەو جـۆرە، وەك (کتـاب النکـاح)و (کتـاب الجـراح)و هـی تـریش هـەر مـاوە، و لـە کاتێکـدا کتێبـی سەربەخۆ نین، لە چوار چێوەی کتێبی تر دان، هەر وەك خودی (ابن ندیم) لە باسی ناو هێنانی کتێبەکانی (داود الظاهری)دا، نووسیویەتی: (والکتب الأولی یحتوی علیها کتـاب سماه السِّیَر) کە ئەم قسەیەش دەیسەلمێنێت، کـە ئـەو (کتـاب)انـە، لـە چوارچـێوەی کتێبی تردا بوون، و سەربەخۆ نەبوون، و بەم شێوەیە قسەی (شـەهابی) سـەبارەت بـە (شەیبانی) بەرپەرچ دەدرێتـەوە، و دەربـارەی ئـەوەی کـە (عبـدالرحمن کـوڕی مهـدی) داوای لە ئیمام شافیعی کردووە، کە کتێبێك لە بارەی ئوصوڵ فیقهەوە دابنێت ، ئەمـە سەلمێنەری ئەوەیە کە لەو کاتەدا پێویستیان بەو بابەتە هەبووە، و پێویـست بـوونیش بۆ شتێکە کە نەبێت و دەست نەکەوێت، و هەروەها (ابن خلکـان) یـش ئـەوەی ووتـوە، کە ئیمامی شـافیعی بـە (ڕەهـایی:مطلقـا) داهێنـەری ئوصـوڵی فیقهـە، و ئـەبو یوسـف داهێنەرە، تەنها لـە مەزهـەبی حەنەفیـدا، نـەك بـە ڕەهـایی، ئەوەیـشی درکانـدووە کـە ئیمامی شافیعی ئەم کتێبەی لە سەردەمی گەنجیدا داناوە، و دەکرێت کتێبەکەی (ئەبو یوسف) دواتر بووبێت، و سەبارەت بە (شەیبانی)یش ئەوەیە، کـە ئیمـامی شـافیعی لـە

ساڵی (١٥٠)ی کۆچیدا لە دایك بووە، و لە ساڵی (١٩٥)دا لە بەغداد لەگەڵ شەیبانی دا چاویان بە یەکتر کەوتووە، و نوسخەی کتێبەکانی ئەوی گرتۆتەوە، و کەواتە لەم کاتەدا ئیمام شافیعی (٤٥) ساڵان بووە، و کتێبی (الرسالة) کە لە گەنجیدا نووسیویەتی، بەهیچ جۆرێك پەیوەندی بەم کات و ساتی بە یەکگەیشتنەیان نەبووە، و لەو لایشەوە هەر یەك لە (شەیبانی) و (ئەبو یوسف) هەردووکیان لە موجتەهیدە مەزنەکانی مەزهەبی حەنەفین، و ئەگەر ئەوان داهێنەری ئەم زانستەن، ئەوا یەکێك لە زانایانی مەزهەبەکەیان ئەم ڕاستییەی دەردەخست، و دەیان نووسی، و ئیتر داهێنەر بوونی ئیمامی شافیعی لەم بوارەدا نەدەبوو، بە ئیجماعی زانایانی ئیسلام .

سەبارەت بە قۆناغەکانی گەشەسەندنی زانستی (أصول الفقه)یش، زانای گەورە (ابن خلدون) لە کتێبە مەزنەکەیدا بەناوی (مقدمة)، وای نووسیوە، کە لە دوای ئیمامی شافیعی، و شەرعزانەکانی مەزهەبی حەنەفی دەستییانکرد بە نووسین لەم بوارەدا، و گەشەپێدانی ئوصولی فیقهـ، و هەروەها زانایانی (کەلام)یش لەم بوارەدا کتێبیان نووسی، بەڵام ئەمان زیاتر بایەخیان بە (ئیستیدلالی عەقڵی)دەدا، وەك لە دۆزە شەرعیەکان و خاڵە فیقهییەکان، کە فەقیهە حەنەفیەکان لەم بوارەدا ڕۆچووبون، و یەکێك لە زانا، و شەرعزانە گەورەکانیان بە ناوی (أبو زید الدبوسی) زۆر بە فراوانی هەستا بە نووسین لە سەر (قیاس)و مەرجەکانی، و دوای ئەوە کە زانستی (أصول الفقه) هاتە ناوناوان، و گەشەی سەند، و برەوی زیاتری پەیداکرد، خەڵکی ڕوویان لە ڕێبازی کەلامی یەکان (المتکلمین) کرد، لەم بوارەدا، و لە چاکترینی ئەو کتێبانەیش کە لە سەر ڕەوتی کەلامییەکان دانراوە، بریتین لە (البرهان)ی ئیمامی حەرەمەین و (المستصفی)ی ئیمامی غەزالی، کە هەر دووکیان ئەشعەری بوون، و هەروەها کتێبی (العمد)ی دانراوی پێشەوا (عبدالجبار)، و شەرحەکەی سەری کە (ابو الحسین ی بەصراوی) نووسیویەتی، کە هەردوکیان موعتەزیلە بوون، کە لەو کاتەدا ئەم چوار کتێبە بە بناغە و بنەمای ڕسەنی (فیقهـ) هاتوونەتە ئەژمار، و دواتریش ئەم چوار

کتێبە لە لایەن دوو زانای مەزنی ئیسلامەوە کورت و پوخت کرانەوە، کە ئەوانیش پێشەوا فەخرەدینی ڕازی لە کتێبی (المحصول) و سەیفەدین ی ئامێدی لە کتێبی (الاحکام)دا بوون، بەڵام ئیمامی ڕازی زیاتر بایەخی بە بەڵگەدار کردنی مەسەلەکان داوە، و ئامێدی زیاتر لە سەر مەزهەبەکان و چڵو پۆپەکانیان قسەی کردووە و ڕۆیشتووە، و لە لایەکی تریشەوە کتێبی (المحصول)ی ئیمامی ڕازی لە لایەن (سیراجەدینی ئەرمەوی)ی کە قوتابی ئیمامی ڕازی بووە، کورتکراوەتەوە، و ناوی ناوەتە (الحاصل).

و زانایان (شەهابی قەڕاخی)و (قاضی ناصرالدین ی بەیضاوی) هەستاون لەو دوو کتێبەی پێشوودا چەند باس و خواسێکیان دەر هێناوە، و هەر یەکەیان لە شێوەی کتێبێکی سەربەخۆدا نووسیوە، کە کتێبەکەی ئیمامی قەڕاخی بە ناوی (التنقیحات) و کتێبەکەی ئیمامی بەیضاوی بە ناوی (منهاج الوصول) ناویان ناوون، کە تا ئێستاش ئەم کتێبانە جێی بایەخی تامەزرۆیانی زانستی ئوصولن، و کتێبەکەی (الاحکام)ی، ئامێدیش، لە لایەن (ابو عمرو بن الحاجب)ـەوە، پوختکراوە، و ناوی ناوەتە (المختصر الکبیر)، و دواتریش کورتتری کردۆتەوە و بۆتە جێگای بایەخی قوتابیان و زانستخوازانی جیهانی ئیسلام و لە لایەن زانایانی مەزهەبی حەنەفیشەوە کتێبی زۆر لەم بوارەدا نوسراوە، کە باشترینیان کتێبەکەی (أبو زەید دەبۆسی)یە، لە زانا کۆنەکان و لەم زانایانەی دوایی مەزهەبی حەنەفیش کتێبەکەی ئیمامی ( سیف الاسلام بەزدەوی)یە، و دواتریش (ابن الساعاتی) کە لە زانایانی حەنەفیە، هەستا هەر دوو کتێبی (الاحکام) و کتێبەکەی (بەزدەوی) پێکەوە گرێدا، و لە سەر شێوازی هەردووکیان کتێبێکی نوێی نووسی، ناوی نایە (البدائع)! کە تا ئێستاش جێگای بایەخی گرنگە لە جیهانی ئیسلامیدا، کە ئەمەش باسکرا قۆناغی گەشەسەندنی زانستی ئوصولی فیقهـ بوو، لە سەرەتاوە تا کۆتایی سەدەی هەشتەم و سەرەتای سەدەی نۆیەمی کۆچی، کە (ابن خلدون)باسیکرد هەر لەو مێژوەشدا نەشونما کردنی زانستی

ئوصوڵی فیقهـ گەیشتە ترۆپك، و ژمارەی كتێبی نووسراو لەم بارەیەوە هێندە زۆر بـوو لە ژمارە نەدەهات، بە جۆرێك كـە (تـاج الـدين عبـدالوهاب الـسبكی) كـە لـە دایكبـووی (٧٢٧)ی كۆچی یەو لە ساڵی (٧٧١)دا وەفاتی كردووە لە پێشەكی كتێبە ناسراوەكەی (جمع الجوامع)دا دەڵێت: كە ئەو كتێبی (جمع الجوامـع)ــەی لـە نزیكـەی (١٠٠) كتێبـی ئوصوڵ و ئەو شەرحانەیشەوە وەرگرتـووە كـە هـەر خـودی ئیمـام (سـوبكی) لـە سـەر (مختصر) ی ئیبن حاجیب و (منهاج الوصول)ی بەیضاوی نووسـیونی،و وەریگرتـووە و كـۆی كردوونەتــەوە و ئــەو كتێبــەی لێ بەرهــەم هێنــاون، كـە ئەمـەش خـۆی لـە خۆیـدا نیشانەی زیادبوونی كتێبی ئوصوڵە، كە بە ڕاستی (جمع الجوامـع)یـش نـاوی خـۆی بـە خۆیەوەیــەتی، و هــەڵگر و كۆكــەرەوەی كتێبــەكانی زانایــانی پێــشینەو دواییینەیــە، و ڕێبــازی (المحـصول)ی فــەخری ڕازی، لـە لێكۆڵینــەوەدا بـە كارهێنــاوە، هــەر بۆیــەش جێگای بایەخی سەرجەم زانایان بووە، هەر لەو كاتەوە تا ئێستاش شـەرح وحاشـیەی زۆری لـە سـەر نووسـراوە، كـە باشـترین و ناودارترینیـان شـەرحەكەی (جـلال الـدين المحلی)یە، كە لە ساڵی (٨٦٤) ی كۆچیدا لـە دایـك بـووە، كەئـەم مـەتن و شـەرحە تـا ئێستاش لەسـەرجەم زانستگاكانی جیهـانی ئیسلامیدا، و بـە تایبـەت لـە كوردسـتانی خۆماندا بە تێكڕای پارچەكانییەوە دەخوینرێت، و ئەم كتێبی (جمع الجوامع)ـە لەلایەن زۆر لە زانایانەوە كورت وپوخت كراوەتەوە، لەوانە (شيخ الاسلام أبو يحيى زكريـا(٨٢٥ – ٩٢٥)ی كۆچی ، كە یـەكێك بـووە لـە زانـا مەزنـەكانی مەزهـەبی ئیمـامی شـافیعی، هەستاوە بـە كورتكردنـەوەی و نـاوی ناوەتـە (لـب الاصـول)، و هـەروەها شـەرحەكەی (جلال الدين المحلی) پوخت كردووە، و ئەویشی ناوناوەتە (غاية الوصول فـی شـرح لـب الاصول)، كەئەم شەرح و مەتنەش لە كتێبە گرنگەكانی زانستی ئوصوڵن، و یەكێكی تر لـە كتێبـە گرنگـەكانی زانـستی ئوصـوڵ بریتییـە لـە كتێبـی (مـسلم الثبـوت) ی زانـای گەورەی هیندی (محب الدين عبدالشكور بهاری) كە لە ساڵی (١١١٩)ی كۆچیدا وەفـاتی كـردووە، كـە وەك كتێبـی (البـدايع)ی (ابـن الـساعاتی) كۆكـەرەوەی هـەردوو ڕێبـازی

حەنەفی و شافیعی یە، و لە دۆزە گرفتاوییەکاندا هەستاوە بە نووسینی شەرح و لێکۆڵینەوەی درێژ و چڕوپڕ، دواتر لە لایەن زانا (عبدالعلی محمد بن نظام الدین ی ئەنصاری حەنەفی) کە لە ساڵی (١١٨٠) ی کۆچیدا وەفاتی کردووە، شەرحێکی لەسەر نوسراوە، کە ناوی ناوەتە (فواتح الرحموت)، کە یەکێکە لە سەرچاوە گەورەو فراوانەکانی زانستی ئوصوڵی فیقهـ.

کە ئەمەش تێکڕا پوختەیەکە لە مێژوی ئوصوڵ، و گرنگترین کتێبەکان لەو زانستەدا، چونکە ژمارەیان زۆر لەوە زیاترە و سەرنووسکردنی هەمویان لێرەدا جێگای نییە، و پێویستیش نییە، و دەکرێت ئەم دەروازەیە بە پوختەیەك لە مێژوی ئوصوڵ دابنێین.

## ﴿متن منظومة عمدة الطلاب، فى علم أصول الفقه﴾

﴿بسم الله الرحمن الرحيم﴾

الحمد لله الذى قد جعلا ... كتابه نورا به تفضَّلا
ثم صلاته، مع السلام ... على النبى مبلغ الأحكام
وآله، و صحبه الهداة ... إلى طريق البرِّ، والنجاة
وبعد فالعبد الفقير الجانى ... ذوالعجز والتقصير والتَّوانى
المدنى الشافعى الفانى ... عبَّاس، من يُعزى إِلى رضوان
يقول ذى عجالةٌ ضمنتُها ... أصول فقه، و قد إِختصرتُها
سميتُها بـ(عمدة الطلاب) ... طالب توفيق، مِن الوهاب
وأسال الله جزيل الاجر ... بها، و عفوا، عن جميع الوزر
فهوالجَوّاد، جوُده لا يُجْحَد ... ذوالعفو، لا ربَّ سِواه يُعْبَد

## ﴿المقدّمة﴾

أصول فقه عندهم أدلته ... وكونها مجملةً، فثُبَّتُهُ
كذاك كيفية الاستدلال ... بها، و حال مستدلّ جال
فالاصل مايبنى عليه غيره ... والفرع ضده، فهذا أمره
والفقه اَن يُعرف حكم الشرع ... العمليِّ من الدليل المرعىِّ
والحكم أن يعاقبن مُجتَنِبُه ... فواجبٌ، أَوْ فاعل فَلَقَبُه
محرَّمٌ، أَمَّا إِذا أُثيبا ... فاعلُهُ، فَندبٌ، أُستُطيبا
أو تاركٌ لَهُ، فمكروهٌ صُراح ... أو لا، و لا، فعندهم، هو المباح
وأن به اعتُدَّ، و قد تعلَّقا ... به النفوذ فصحيح ارتقا
وغيره الباطل حدالعلم ... معرفة المعلوم ، كن ذاحزم

خلافه جهل، وأن تــوقــفـــا علـــى نظر ، مكتسب فلتعرفا
وغيره يدعى الضـــروری النظر فكرُك فـــي المطلوب ذاقداشتهر
ثم الدليل المرشد المـعـتـمـد والظن درك راجـــح يعتضد
والوهم أدراكك للمـرجـــوح والمستوى شك ، بلا رجـــوح

﴿الادلة المتفق عليها ، للاحكام الشرعية﴾

كتاب ، سنة ، أتفاق والـقياس أدلة أربعة بــــــلا الالتباس

﴿الكتاب﴾

قالوا الكلام عندنا أقســـام أمـــر، و نهى، قسم، استفهام
عرض، تـمـنّ، خـبر حقيقة ثم المجاز، فــأعــرفـــن طريقه

﴿ الامر والنهي ﴾

الامرطلب الفعل من قد ارتقى بأفعل ، وللجـوب ذاأن أطلقا
لايقتضى التكرار والفـور اِلا اذا عليهمـــــا، دليل دلا
ولِأمر موجب لـــمـــا توقفا هـــو عليــه ، فاعلمن لتشرُفا
وليس بالنهى عـن الضـد ولا مستلزماً لَهُ، كذا النهى اجعلا
و يدخل المؤمن فية، لا هـبِّى و مكره مـجنـون ساهٍ فأدبِ
والكافرون خوطِبوا بـالفـرع و شرطه ، فانقذ لحكم الشرع
و الامرللتهديد، والنـدب يرد كـــذا أباحـة، لغير ذا وُجِد
والنهى أن يطلب تـركُ الفعل وفيه ما قد مَرَّ، يــا ذا الفضل
لكنَّهُ للفوز، والـــدم وام ولا اِشراط فـيــه، لِلاسلام

## ﴿الخبر و الانشاء﴾

محتمل الصـــدق، و ضـــدُّه الخبر　　و غيره الانشاء، فاحـــــــذر البطر

## ﴿الحقيقة والمجاز﴾

وكل ما بقي على ما قد وضع　　لـــــه حقيقة كأسد، للسبح
وغيره المجاز، ذو أنـــــواع　　كأسد للرجل الشـــجـــاع

## ﴿ العام ﴾

والعام مـــا يشمل فوق واحد　　ولفظه ذو اللام، نحو الحاسـد
فرداًوجمعاً مبهم ، اَسم عمَّ لا　　في النكرات كُـــل ذا قد نُقِلا
عُم العموم مـن صفات النطق　　و ليس في فعل فكُنْ ذا حِذقِ
ونـحـو ، لا أكلتُ إنْ أكلتُ　　تعميمُهُ أصَحُ، مـــــا رأ يتُ

## ﴿التخصيص﴾

تخصيصهم تميز بـــعض الجملـة　　قبل العمل بالشرط، أو بـــالصفة
و يحمل المطلق يا من فصـــلنا　　عـــــلـــــى مقيَّد بها، إِن أمكنا
وخصصوا ايضا بالاستثنـــا ولا　　بدَّ، لديهم أن يــكـــون موصلا
وغيرمستغرق ثــــــم المنقطع　　يجوز كالتقديم قطعاً، فـــاستمع
وخصص الكتاب بالسنـــة وبه　　و هي بما ثم، به فــكـــــن نبه
ثم هما يخصصان بـــــــالقياس　　ذا رجــــع اليهما هما الاساس
و عطف ما عمم على ما خصصا　　وعكسه فلم يـــكـــن مخصصا

## ﴿ المجل والمبين، و هو النص ﴾

وكــــــــــل محتاج اِلى البيان　　فمـجمل عند، ذوي الـعـــرفان
خـــــلافـــــه المبين النص فذا　　لـــغيـــــر معنى واحد، ما أخذا

## ﴿الظاهر و المؤول﴾

ما أحتمل الأمرين، أن يحمل عـلـى — أظهر فهوظاهر، قـــد انجلا
و ما على الاخر،قطعا يـحـمـل — أي بـدليل ، فَاِسْمُهُ الـمُؤَوَّلُ

## ﴿ النسخ ﴾

النسخ أن يرفع حـكم الشرع — و قيدوا ذا، بـــدليل شرعى
ثم الـــى أربعة قد قسما — الـــى اخف اغلظ فلتعلما
و بدل، و غيره، و قـــد نقل — نسخ كتاب، بـكـتاب لا تضل
كذلك بالسنة، و هـي بهما — فـاجتنب الغفلة، كيما تفهما

## ﴿ السنة ﴾

و سنة فـعـل النبىﷺقوله — و هو قد احتجَّ، بـــه و فعله
اِن كان قربة و دلَّ باهـــر — عـــلى اختصاصه به فظاهر
و الا على وجوب او ندب حُمِل — او يوقفَن هذا اختلاف قـد نُقِل
او غـــيـــر قربة مباح ظاهر — و يوجب العلم لـــنـــا المتواتر
مـــن سنـة، وغيره للعمل — و لا احتجاجاً، عندنا بـــالمرسل
و استثن من هذا مـراسيل سـعيد — ابـــن المسيب لاسناد مُفيد
ثم الصحابى هـــو المجتمع — مصدقا بالمجتبى المـشـفـع
و غير شرط الروايـة كـــذا — طول اجتماع تابعا كـــذا خُذا

## ﴿ الاجماع ﴾

هـــو اتفاق فقهاء العصر — بعد وفاة المصطفى فـــى أَمر
و هو لـديهم حجة فى الدهر — و غير شـــرط انقراض فأَدرِ
بقول، أو فعل مـن الكل يقع — أو بعضهم و غيره لـــه خضع
و قول واحد، غـدا ذا صحبة — على الجديد ليس هـــو بحجَّةٍ

و كفّروا منكــر مُجمَعٍ عـليه | من ديننا، و هـــو قد اضطرَّ اِليهِ
ذا مطلق اِن كــان فيه نــص | أوْلا على الاصح لـــــم يغصّوُا

## ﴿الــقِــيـــاس﴾

قيـــــاسهم حَمْلٌ لِمعلومٍ على | مثلٍ لـــــــهُ، اِذا تَساوِ حَصَلا
فى علّة الحــكـــم فاِن توجبه | فبِقياسِ عـــلّـــــــة لَقّبْهُ
أَمّا اِذا دلّت عــلـيـــه فَقِياس | دلالة عندهم بــــــــلا التباس
اَو كان ذاك الفرع قــــد تَرَدَّدا | من بَين اَصليْنِ لــــــه قد وُجِدا
و أَلحقوه يـــــــا اَخى بالاشبَهِ | فـــهـــــو لديهم قياس الشبَهِ
و اشترطوا لِحُكمِ ذاك الاصـــل | ثبوته اَى بـــــــــدليلٍ فصلِ
و اشترطـــــوا ايضاً لَهُ اِطّراداً | كذاك علّة، فَكُن جَـــــــواداً
و هــــى التى قد جَلَبَت للحكمِ | فاسمع لِذا تَسْمُ بحسن الفـهـــم
اِن لــــــم يَكُن لحادثٍ دليل | اِحتَجَّ باستصحابِ اَصلِ جـيــــل
و أصلُ ضـــــارٍ حُرمةٌ و النافعُ | حِلٌ، و ذا بعدَ الرســول الشافعﷺ

## ﴿ الاستدلال ﴾

اذا تعــــــارض دليلان هُمــا | ذوعموم اَوخصوص بهمـــــا
والجمع كـان مـمـكنا بينهما | فـــــــذاك واجب وألاقفهُما
ان واحــدهم عُلم بـــالتـاَخر | فناسخ عند، اَولى التدبـــــر
اماإذا تعــارض العام وخــاص | خُصَّ بـــــه ومالنامن ذامناص
اوكان كــلً منها خاصاوعــام | كلابكل خـصه فلا تَـــــلام
وظاهرا، ومـوجب العلم علــى | مؤوّل والظن قــــدم تَعْدِلا
كذاكتاب سنــــــة قد قدمــا | على القياس عندهم بـذا حكما

وهـــــوجلية مقدَّم عــلــى خفيه فاستحضرَن المـثــــلا
وفقه مبنــى عـــلــى ان اليقين لا يرفعن بالشك قطعا كل حين
عادتناقدحكمت ثــــم الضر يزال يا هذا، كما جــا في الخبر
ولامرأن ضـــاق اتَّسع فيسهل عملنا بنيَّة قـــــــــد يحصُل

﴿ شروط المستدل، و هو المجتهد ﴾

ومن شروط المستدل المـجتهد عندهم عــــلــــم بفقهِ، فاعتمد
أصلا،و فرعا،وخـلاقا للفحول والناسخ والمنسوخ، أسباب النـزول
وبمهم، لـــغـــــة، تفسير أخبار، آيات مـــــــن الخبير
والنحو والصــرف، رواة الخبر وغيرذا، من الذي لـــــم يذكر

﴿ خاتــــــــــــــمة ﴾

*في حَدَّيْ الاجتهاد والتقليد، وذكر بعض ما يتعلق بهِمَا:*

الاجتهاد بذل وســـع فـــي طلب تحميل ظنّ حكم شرع قـــــد وجب
صاحبه يأثـــــــم حيثُ قصَّرا وأن اَصاب، لا تكُـــــن مقصَّرا
وأجرُه، معَ الصَّواب كـــــــرّرا وضدُّه، فلم يـــكـــــن مُكَرَّرا
تقليدنا، قبول قــــــول، يُؤثر من غير حُجَّة، عــلــيـــــه تُذكــر
وهُوَمُحَرَّمٌ، عــلـــى المجتـــهد هذا، و في حفظ الاصول اِجتهـــــد
وتـــــم نظمي عـــمـدة الطلاب مؤملا سترا، مـــــن الوهـــاب
و لائذا، بالله مــــن شــرالحسود والنفس، والشيطان، والوغد الكنود
فأحمد المولى علـــــى صـــلاتِهِ و أطلـــب التـسلـــم، مَعَ صلاته
عـــلى رسول الله، مــصـدر النعم و آله، و صحبـــه، ذوي الكــــرم
مـادام فضلُهُ، عـــلــــى العباد في هذه الدار، و فـــــــي المعاد

﴿بسم الله الرحمن الرحيم﴾

(بسم الله)، بـــــــــه هۆی ناوی ئەوخودا
خاوەن تەجەللای، صیفاتە، وئـــــــــەسما
هـــــــــەر ئەو واجبە، و هەر ئەوە مەعبود
هەر ئەو خالقە، بۆ هـــــــــەر دوو دنیا[٣]

<u>ئیعرابی ( بسم الله الرحمن الرحيم ):</u>

ب : حەرفی جەڕ.

اسم : أسم مجرور ، جارومجرور موتەعەللیقە بە عاملێکی مقدره ، (شاراوە) وە، کە (ابتدا)یە، وهو مضاف.

الله: مضاف اليه، و ( اسم علم ) يشه

الرحمن الرحيم : صیفەی مبالغەن، لەسەر قەولی ( أصح ) ی زانایانی (نحو) وە ( صیفەی مشبهـ )ـەن و مەجرورن.

* ئایا دروستە دوو ( صفة ) لە شوێن یەکتری بێن؟

_ بەڵی دروستە: وەك چۆن دوو خەبەر و دوو حال لە شوێنی یەك دێن.

---

٣ ﴿بەهار، وگوڵزار﴾، مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس،(گۆڕی پڕ نوور بێت)، چاپی سنە، ٢٠٠٨.

## ﴿پوختەیەك دەربارەی ( بِسْمِ اللهِ الرَّحْمَنِ الرَّحيم )﴾ :

لە سەر کەسرەی پیتی"باء"زانای زمانزان سێبەوەیهی پێی وایە، لە بەر ئەوەی کەعەمەلی "باء" هەمیشە مەجرورکردنە، هەر لەم ڕووەوە بائەکە کەسرەی لە ژێردا دانراوە، تا لەگەڵ عەمەلەکەیدا هاوڕێك ببێتەوە، و زانای گەورە "مبرد"یش پێی وایە، کە کەسرەی بائەکە لەو ڕووەوەیەکە پیتی "باء"، لەو پیتانەیە کە بە "ذوات الیاء" ناسراون، واتە: "باء" لە ئەسڵدا "بی" بووە، کە "یاء"حەزفکراوە، و دواتر کەسرەکە موناسەبەتی لە گەڵ"یاء"دا هەیە، و گونجاوە لە گەڵیدا لە جێی یائەکەدا ماوەتەوە، بۆ مانای "باء" زانایان پێیان وایە، کە مانای "حەقیقی:ڕاستەقینە"ی"باء" بریتی یە لە (ألصاق:پێکەوە لکان)، بەڵام لێرەدا بە شێوەیەکی گشتی مەبەست مانا حەقیقی یەکەی نی یە، و دیسانەوە لە سەر مانا مەجازی یەکەیشی ڕاجیایی هەیە، هەندێ لە زانایان ڕایان وایە کە "باء" لە (بسم اللە)دا، بۆ (أستغاثة:پشت پێ بەستن)ـە، وە یاخود بۆ (مصاحبة:هاوڕێیەتی و لەگەڵدابوون)ـە، و مەبەست لە (أستعانة) ئەوەیە کە ئەچێتە سەر ئالەتی فیعلەکە، وەك"کتبت بالقلم"، و مەبەست لە "باء"ی موصاحەبە ئەوەیە کە بە مانای "مع" دێت، وەك(و قد دخلوا بالکفر)أی: مع الکفر!

بەڵام ژمارەیەك لە زانایان مانای (أستعانة)یان لە پێشتر داناوە، چونکە (أستعانة: پشت پێ بەستن) زیاتر لێرەدا لەگەڵ ناوەکەی خوای

پەروەردگاردا گونجاوترە، ومانایەکی پڕاوپڕوپڕ لە سودی هەیە، کەچی لە موصاحەبەکەدا ئەو مانا جوانەی لێ نافامرێتەوە.

وە هەندێکی تردەڵێن: چونکە مەبەست و مەرامی تەواو لێرەدا ، سوپاسی خواوەرخستنی بەندایەتی و پەرستنی ویی یە، و داواکردنی یارمەتی و ڕێنوێنی یە لەزاتی خوای پەروەردگار، بۆیە ئەم کارە گەورەیە کە لە چوارچێوەی (بسم اللە الرحمن الرحیم)دا جێی بۆتەوە، پێویستە ئەو "باء"ـە، بۆ پشت پێ بەستنی ئەو زاتە

بێت لەسەرجەم ئەو کارانەدا، وە لێرەدا پێویستە جەخت لەسەر ئەوە بکرێتەوە، کەئەوەی ڕابورد بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە "باء"لە "بسم الله"دا بە مانای ئیبتیدایە.

## ﴿أســـم﴾:

لە لای بەصری یەکان "أسم" لە "سمو"ــەوە، وەرگیراوە، کە مانای "رفعة: بالآیەتی" هەیە، وە ئەسڵەکەی "یسمو"وە، چونکە جەمعەکەی "أسماء"ــە، وەك "قنو"و"أقناء"، وە ئیسمە بچوککراوەکە (مصغر)ـەکەی، "سمی"یە.

و لە لای کوفییەکان "أسم" لە "وسمة" وەرگیراوە، کە بە مانای "علامة" دێت، بەلأم گوتەی یەکەم ڕاسترە، چونکە وشەیەك کە (فاء الفعل)ـەکەی مەحزوف بێت، وە هەمزەی موتتەصیلی پێوە لکابێت، لە زمانی عەرەبیدا بەکار نەهاتووە، وەك (صلة)،(وصل)،(عدة)،(وعدة)، و بەڵگەیەکی تریش ئەوەیە کە هەر کات وەرگرتنەکەی لە (وسیم) یان، (سمة)ـەوە، هاتبێت، دەبێت هەر لە حاڵەتی تەصغیرەکەیشیدا هەر (وسیم) بە کار بێت، لە کاتێکدا کە لە عەرەبەوە بۆ تەصغیری (أسم)،(وسیم) نەبیستراوە، بەلأم بۆ تەصغیری (عدة)، (وعدة)، (وعیدة)، (صلة)، (وصل)، (وصیلة) بیستراوە.

## ﴿اللـــه﴾:

ئەم ناوە پیرۆزە لە ئەسڵدا (ألاله)بووە،کە هەمزەی دووەمی لەئەنجامی زۆر دووبارە بونەوەیدا حەزف کراوە، کە مانا ڕەسەنەکەی پەرستن وسەرسامی (متحیر)بوونە، وە لەو ڕووەوە ماناکەی لێك دراوەتەوە، کە بەس خوای گەورە شایەنی پەرستنە، وە عەقڵ وهزر و لۆژیکی مرۆڤەکان لە ئاستانەی ئەو زاتەدا سەرسامن!

هەندێ لە زانایان ئەم ناوە بە عەلەم دادەنێن، بۆ خودای "واجب الوجود"کە کۆکەرەوەی سەرجەم صیفاتەکانی کاملێتی یە، ولە پیاوچاکانەوە بیستراوە کە فەرمویانە: (ألله): ناوی هەرە گەورەی خودایە، چونکە بەڵگەیە لە سەر تەواوی ناوە

جوانەکان، و صیفاتە بالأکانی پەروەردگار، بەلأم ناوەکانی تر هەر یەکەیان ئامـاژە بـە لایەنێك، و پلەیەك لە پلەکانی خوای بالاّ دەست دەکەن.

وە هەندێکی تر لە زانایان پێیان وایە، کە ئەم لەفزە هەمیشە مەوصـوفە، و هـەرگیز نابێتە (صفة)، وئەم مانایەش بەڵگەیە لەسەر عەلەم بوون،واتە:ئەمە لەو بەڵگانەیـە کـە ئاماژە بە عەلەمبوونی ناوی (ألله)دەکەن.

وە سەرجەم ناوەکانی تری خوای پەروەردگار دەکرێت کـە ببنـە صـیفەت، چـونکە هەر یەکـەیان بـاس لەلایـەنێکی دیـاریکراوی خـوای گـەورە دەکەن،بـەلأم نـاتوانرێ کـە (ألله)بە صیفەت دابنرێت، بۆیە بۆ نموونە دروستە بڵێین (ألله العـالم): بـەلأم نـاتوانرێ کە بگوترێ: (ألعالم ألله).

﴿الرحمن الرحیم﴾:

زانایان لە سەر جیاوازی نێـوان ئـەو دوو نـاوە، ڕاجیاییـەکی زۆریـان هەیـە، گوتـەی دروست لەسەر ئەوەیە کە (الرحمن)، لە(الرحمة)ـەوە، ، وەرگـیراوە، کـە لـە زمانـدا بـە مانای"ناسکی دڵ و بە عاتیفە بوون"یەوە هاتووە، بـە دەسـتەواژەیەکی تـر (الرحمـة): واتـە: میهرەبانیـەك کـە فـەزڵ و چـاکە کـاری لـە گەڵدایـە، وە خـاوەنی (الکـشاف): گوتویـەتی(الـرحمن)، لـە زمـانی عیـبری یەکانـە و (الـرحیم)، لـە زمـانی عارەبـە، و کافرەکانی قوڕەیش لە سەردەمی نەفامیدا ناوی (الرحمن)یان نـەدەزانی، هـەر وەك لـە کرۆکی ( و ما الرحمن) و (یکفرون بالرحمن)یەوە دەفامرێتەوە.

وە هەندێکیش لەسەر ئەوەن کە لەفزی (الرحمن)عەرەبی یە، بەلأم لە تەوراتدا بـاس کراوە، وە گێڕدراوەتەوە کە عەبدوڵلای کوڕی سەلام پرسیاری لە پێغەمبەر (صلی اللـه علیه وسلم) کـرد، گـوتی:ئـەی پێغەمبـەری خـوا(صـلی اللـه علیـه وسـلم)، ئێمـە نـاوی ڕەحمانمان لەتەوراتدا زۆر خوێندۆتەوە، بـەلأم لـە قورئانـدا کـەمتر هـاتووە، ئـیتر ئـەم ئایەتە نازڵ بوو:

﴿قُلْ ادْعُوا اللَّهَ أَوْ ادْعُوا الرَّحْمَانَ أَيًّا مَا تَدْعُوا فَلَهُ الأَسْمَاءُ الْحُسْنَى وَلاَ تَجْهَرْ بِصَلاَتِكَ وَلاَ تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلاً(الاسراء :١١٠)﴾ پێیان بڵێ: لەنزاو دۆعاکانتاندا ئەگەر ناوی پیرۆزی (الله) بەرن، و یان هاوار بە هەر یەکێ لە سیفەتە پیرۆزەکانی ئەو بکەن، بۆ نموونە: وەك (الرحمن) هەر یەکە، و قەبووڵە، جا ئێوەش بە هەر ناوو سیفەتێکەوە، لەو ناوو سیفەتانە بۆخۆی دیارییکردوون، دەتوانن داوای لێ بکەن و هاواری بۆ بەرن ، چونکە ناوی پیرۆزی خوا زۆرن، ئەم دوانەیش: (اللە، الرحمن) هەر لەوانن، لە کاتی خوێندنی قورئاندا بە تایبەت لە نوێژەکانتدا دەنگ بەرز مەکەرەوە، و مەقیرێنە تا قورەیش نەبیستن و جنێو نەدەن بە دینەکەت، زۆریش هێواش و نزمی مەکە، بەڵکو لە سەرخۆ بە، و بە شێوەیەك بیخوێنە کە ئەوانە لە پشتەوەن گوێیان لێبێت، لە نێوان ئەو دوو حاڵەتەدا ڕێگایەکی مامناوەندیی و لەبار بۆ خۆت ڕەچاو بکە(١١٠)﴾، واتە:ئیتر بەناوی(أللە)وە بخوێنن، یان بەناوی (الرحمن)ـەوە، ئەم دوو ناوە هەردوکیان تایبەتن بە خودا.

و کەسانێکیش گوتویانە کە(رحمن)صیغەی موبالەغەیە،وبەڵگەیە لەسەرزۆری وفراوانی، وە لەپیاو چاکێکیشەوە گێڕدراوەتەوە کە فەرمویەتی: "الرحمن": ناوێکی تایبەتە بۆصیفەتێکی گشتی، واتە،(الرحمن):ناوێکە کەبەکار هێنانی بۆ غەیری خوای پەروەردگار نابێت، چونکە تیایدا میهرەبانیی وڕەحمەت بۆ سەرجەم بونەوەر دەفامرێتەوە، و صیفەت گەلێکی وا پڕ مانای لەخۆگرتوە، کە تەنها بۆ زاتی پەروەردگار دەبن.

وە(الرحیم): ناوێکە کە لەفزەکەی گشتی یە، بەڵام ماناکەی تایبەتە ،واتە: ناوێکە کەبەکارهێنانی بۆ غەیری خوای پەروەردگار دروستە، چونکە بەڵگەیە لە سەر صیفەتێك کەبەسنورداری لە هەندێ بەندەو دروستکراودا هەیە، بەڵام بە مانا فراوانەکەی کە ئەوپەڕی میهرەبانی نواندنە، تایبەتە تەنها بە زاتی پەروەردگارەوە.

وە لەسەر ئیعرابی (الرحمن الرحیم)، چەند ڕایەك هەیە:

أ:هەردوکیان مەڕفوعن، کە لەم شێوازەدا دەبنە خەبەر، بۆ موبتەدایەکی مەحزوف، وەك: (هو الرحمن، و هو الرحیم).

ب:هەردوکیان مەنصوبن، کە لەم کاتەدا مەفعولن، بۆ فیعلێکی مەحزوف وەك: (أعني الرحمن و أعني الرحیم).

ج:هەردوکیان مەجرورن، کە لەم شێوازەشیاندا، دەبنە صیفەت بۆ(ألله)، کە مەوصوفەکەیە.

الحمد لله الـــذی قـــد جعلا کتابه نـــــورا بــــه تفضّلا
ثم صلاته، مــــع الســـلام عـلـــــی النبی مبلغ الأحکام
وآله، و صــحبــه الهـــداة إلـی طـــریـــق البرِّ، والنجاة

---

( الحمد لله ) هــــەموو ستایــــش
هــــــەر لە بۆ ئەوە ، بـە بێ ئالایش
هەر شتێ هــــــەبێ، لــــە کائیناتا
بە سوپاسی ئـــــەو، ئـەکا نومایش
* * *

صەلات، و سەلام، ئـەزەل، تـــا ئەبەد
بە تایبەتی بێت ، بۆ سەرموحەممەدﷺ
بەسە، بۆ ســــــەنای قورئانی کەریم
( انك لعلی خُــــلُـــــــــق عظیم )
برژێ بە سەریا، صەلات، و ســــــەلام
هەر چەند شایانە، بـــە شانی تـەعظیم
* * *

هەم برژێنە سەر ئــــــال و یارانی
بۆ ســــــــەر ئەتباعی فیداکارانی
تا پرتەو ئەدا، هەتاو بــــــە هـەوا
تا هەور ئەرژێ، تـــــاوی بارانی
گەلێ رازی بوو، لەو گەلە، خــــودا
چونکە بۆ خودا ، بووبوون بـــە فیدا
داوای رەزایشی لـــــــەو گەلە ئەکرد

چونکە تالب بوون ، بـــــۆ ڕەزای خودا
لە ئەنا لە سەر ئال و ئـــــــــەصحابا
بەسە چەند ئایەت لـــــــــە ناو کیتابا
پاش ئەنای خودا، ئەنای پێ نـــــاوێ[٤]
ئـــــەو کەســـەی ئەڕوا، بە ڕێی صەوابا

صلاة: لە خواوە، مەبەست پێی رەحمەتە، وە لە لای فریشتەکانەوە، مەبەست پێی داوای لێبوردنــە بــۆی، وە لــە لای موســڵمانانەوە دوعایــە، وە لــە لای گیانــدار و پەلەوەرەوە ، مەبەست پێی پاك ڕاگرتنی خوایە.

ئەمــەش: برژێنێـت بـە بـەردەوامی بەســەر چـاکترین دروسـتکراوان، و گـەورەمان محمد(ﷺ)، وە شوێنکەوتوانی بە گشتی.

* * *

٤. ﴿بەهار، وگوڵزار﴾، مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس،(گۆڕی پڕ نوور بێت)، چاپی سنە، ٢٠٠٨.

وبعد فالعبد الفقير الجانـــــى ذوالعجز والتقصير والتّوانـــــى
المدنى الشافعى الفـــــانى عبَّاس، من يُعزى إِلـــــى رضوان
يقول ذى عجالةٌ ضمنتُهـــــا أصول فقه، و قـــــد أِختصرتُها
سميتُها بـــــ(عمـدة الطلاب) طالب توفيق، مِـــــن الوهاب
وأسال الله جزيـل الاجـــــر بهـا، و عفوا، عـــــن جميع الوزر
فهوالجَوّاد، جـوُده لا يُجْحَـد ذوالعفـو، لا ربَّ سِواه يُعْبَـــــد

---

**پاشـان:** بەنـدەی کـەم توانـا، و ناچـیز، عەبباسـی، کـوڕی موحەممـەدی، کـوڕی ئەحمەدی، کوڕی سەیید ڕیزوانی مەدەنی شافیعی، کە خاوەنی ئەم پەیامە زانستییەی ئوصولی فیقهە، دێتە مەیدان، و دەڵێت:

شێخ عەبباسی مەدەنی شافیعی دەڵێت: لـەم پەڕتوکەیدا کـە لـە زانستی ئوصـولی فیقهدا، بە دەست، و برد، هۆندوومەتـەوە، کـورت و پوخـت تـرم تێـدا هێنـاوە، و نـاوم ناوەتە (عمـدة الطـلاب)، داواکـارم لـە خـوای بەخـشندە، هاوکـار، و پـشتیوانم بێـت، و پاداشتم بداتەوە، و لە گوناهەکانم خۆشبێ، چونکە بە ڕاستی دەریای بەخشندەیی ئەو زاتــە لــە فراوانیــی، و گەورەییــدا نکـۆڵی لـێ ناکرێـت، هەرئـەو لێبوردەیـە، و تــەنها زاتێکیشە، کە شایانی پەرستنە.

# ﴿المقدّمة: پێشەکی﴾

أصول فقه عندهم أدلتـــــــــه وكونـــــــــها مجملةً، فَتُثَبّتُهُ
كـــــــذاك كيفية الاستدلال بها، و حـــــال مستدلّ جـــال

---

پێناسەی گشتی ئوصولی فیقه: لێرەوە دەست پێدەکات، کە پوختەکەی ئەوەیە: (علم يبحث عن ادلة الفقه الأجمالية، و كيفية الأستفادة منها، و حال المستفيد).

أصول الفقه: ناوێکە، عەلەمێکە، بۆ زانستێکی دیاریکراو، (فيعرف بأنه) بۆیە وا پێناسە دەکرێت، (علم يبحث)، زانستێکە دەکۆڵێتەوە، ( عن أدلة الفقه الاجمالية)، لە دەلیلەکانی فیقهی ئیجمالی، واتە: گشتییەکان، بۆیە لێرەدا دەردەکەوێت، کە لە (أصول الفقه)دا، لەدەلیلی فیقهی ئیجمالی دەکۆڵرێتەوە، بەلاّم لە فیقهدا لە دەلیلە تەفصیلییەکان دەکۆڵرێتەوە، (و كيفية الاستفادة منها)، وە هەروەها دەکۆڵرێتەوە، لە چۆنیەتی سوود وەرگرتن، لە دەلیلە ئیجمالییەکان، ( و حال المستفيد)، و هەروەها دەکۆڵرێتەوە، لە حاڵی موجتەهید، ئەو کەسەی کە سوود لە دەلیلە ئیجمالیەکان وەر دەگرێت، وە ئیستیفادەکەیش لێرەدا ئەحکامە شەرعییە عەمەلییەکانە، کە لە دەلیلە تەفصیلیەکان وەرگیراوە، بە هۆکاری دەلیلە ئیجمالییەکانەوە، و بزانە زانایانی تری ئوصول باسی ئەحکامیشیان لێرەدا هێناوە، کە لە ئوصولدا باسی لێوە بکرێت، کەواتە مەبەست لە و گوتەیەمان کە دەڵێت: (الاجمالية)، واتە: (القواعد العامة: بنەما گشتی یەکان)، ( مثل : قولهم ) وەك ئەوەی کە دەڵێن (الامر للوجوب: ئەمر بۆ واجب بوون)ـە،

کە ئەمە قاعیدەیەکی عاممە، مەبەستیش لە قاعیدەی عاممە ئەوەیە: کە حوکمی جوزئیاتەکان لە قاعیدە کولیەکەوە دەزانرێ، کە ئێمە بە ئیجمالی ناومان برد، ئینجا بزانە قاعیدەی کوللی ئەوەیە، کە: (ينطبق حكمها على الجزئيات التي تندرج تحتها)،

مەبەست لەو قسەیە، ئەوەی پێشووە کە ووتمان: حوکمی جوزئیاتەکان لە ڕێی کولیاتەکانەوە دەزانرێت، بۆ نموونە: (و أقیموا الصلاة) کە دەلیلێکی تەفصیلییە، چونکە بۆ مەسەلەیەکی دیاری کراو دانراوە، کە نوێژە، بەڵام حوکم دەرهێنان لێوەی، لە ڕووی دەلیلی ئیجمالییەوە، ئەوەیە کە (أقیموا)، فیعلی ئەمرە، و ئەمریش بۆ، ووجوبە، کەواتە (أقامة الصلاة) واجبە یان (اتوا الزكاة)، کە ئەمیش هەر وەك ئەو وایە کە بە هۆی (الامر للوجوب)، حوکمی مەسەلەیەکی جوزئی زانرا، کە نوێژە وە بە هۆی (الامر للوجوب)، کە قاعیدەیەکی کوللی یە، و یەکێکە لە دەلیلە ئیجمالییەکانی فیقهـ، کە بە هۆیەوە موجتەهید دەتوانێ (استنباط: دەرهێنان)ـی، ئەحکامی شەرعی عەمەلی بکات، لە دەلیلە تەفصیلییەکانەوە، لە ڕێی قاعیدە کولیەکانەوە .... و یاخود دەگوترێت: (و النهی للتحریم)، وە نەهی بۆ حەرام کردنە، وەك ئەوەی کە خوای گەورە دەفەرموێت: (و لا تقربوا الزنا)، کە قاعیدە عاممەمان هەیە، (النهی للتحریم) و ﴿لا﴾. یش، بۆ نەهیە، بۆیە حوکمی مەسەلەیەکی جوزئی کە .. زینا .. یە زانرا ، بەهۆی دەلیلە ئیجمالیە عاممەکەوە، کە حەرامە، ( و الصحة تقتضی النفوذ)، وە قاعیدەیەکی تر، وەك ئەوەی کە ئەگەر عیبادەتێکی یان بەیعێکی صەحیح کرا، ئیتر دەکرێت تەنفیز بکرێت، بۆ نموونە: کە کڕین و فرۆشتنێکت کردووە، و کە زانرا صەحیحە، و هەموو مەرجەکانی بەیعی تیادا.

هاتووەتە دی ، ئیتر کڕیار، و فرۆشیار بۆیان هەیە، تەصەڕوف لە پارەکە، و شتە فرۆشراوەکەدا بکەن، چونکە بەیعەکە صەحیحە.

(فخرج به الادلة التفصیلیة)، جا کە ووتمان: الادلة أجمالیة، ئیتر ئەوەی لێدەرچوو، کە بە ئەدیللەی تەفصیلی ناسراوە، (فلا تذكر فی أصول الفقه) بۆیە دەلیلی تەفصیلی لە ئوصولی فیقهدا باس ناکرێت، چونکە کاری ئەم نییە، و پەیوەندی بە فیقهەوە هەیە، (ألا علی سبیل التمثیل للقاعدة) ئەگەر بیشهێنرێتەوە، تەنها بۆ ئەوەیە نموونە، بۆ قاعیدە گشتی یەکان دابنرێت، هەر وەك لە (و اقیموا الصلاة)و(و لا تقربوا الزنا)دا، کە

دەلیلی تەفصیلین، بەلآم بە نموونە، بۆ قاعیدە کولیەکان هێنراوەتەوە، و جا لێرەدا، بزانە بۆیە (أدلة)، بە کار هات، و (دلائل) بە کار نەهێنرا، لە کاتێکدا هەر دووکیان جەمعن، بزانە کە (أدلة) جەمعی قیللەیە، بۆیە (أدلة)ـی، بەکارهێنا، و چونکە قەواعیدەکان کەمن، بۆیە بە جەمعی (قلّة) هێنای، و (و المراد بقولنا) وە مەبەست لەو گوتەیەمان کە دەڵێین: (و کیفیة الاستفادة منها)، وە دەکۆڵێتەوە، لە چۆنیەتی سوود وەرگرتن، لە دەلیلە ئیجمالیەکان، (معرفة کیف یستفید الاحکام من أدلتها)، بریتییە لە ناسینی ئەوەی کە چۆن ئەو سوودە، کە حوکمەکەیە، لە دەلیلەکان وەرگیراوە، یان بە مانایەکی تر واتە: ناسینی ئەوەی کە موجتەهید چۆن حوکم وەردەگرێت، لە دەلیلە تەفصیلییەکان، ئەم وەرگرتنەش (بدراسة أحکام الالفاظ، و دلالاتها) بە توێژینەوەی لەفزەکان و دەلیلەکان دەبێت، ( و من عموم وخصوص و اطلاق و تقیید، و ناسخ ومنسوخ وغیر ذالك)، لەو دەستەواژانە، ئیتر (عموم، خصوص ، مطلق ومقید وناسخ ومنسوخ والجمع بین المتعارضین، و هتد.... (فأن بأدراکه)، بێگومان بە زانینی قاعیدە کولیەکە، ( یستفید من أدلة الفقه أحکامها)، ئەوا لە دەلیلی فیقهی تەفصیلییەوە ئەحکامی فیقهی وەر دە گیرێت، (و المراد بقولنا)، و مەبەست لەو گوتەیەمان کە دەڵێین: ( و حال المستفید، معرفة حال المستفید، و هو المجتهد، سمی مستفیدا، لانه یستفید بنفسه الاحکام من أدلتها)، وە بزانە کە، (حال المستفید)، بریتیە لە حاڵی ناسینی موجتەهید، وە بۆیە بە (موستەفید: سوودکار) ناوبراوە، چونکە خودی موجتەهید، ئەحکام وەردەگرێت، لە دەلیلە تەفصیلیەکان.

- بۆ ئەتوانێ ئەمە بكات؟

چونكە (لبلوغه مرتبة الاجتهاد)، گەشتۆتە پلەی بە موجتەهید بوون، (فمعرفە المجتهد)، بۆیە ناسینی موجتەهید، و (شروط الاجتهاد)، و زانینی مەرجەكانی ئیجتیهاد، و ( نحو ذالك ) شتەكانی تری وەك ئەمەش، ( يبحث في أصول الفقة)، ئەمانەن لە زانستی (اصول فقه) دا، باس دەكرێت.

پێناسەیەكی تری ئوصولی فیقهـ: (هو العلم بالقواعد و الادلة الا جمالية)، بریتیە لە بوونی عیلم بە قاعیدە عاممەكان، وەك:(الامر للوجوب، و النهى للتحريم)، و... هەروەها بوونی عیلم بە دەلیلە ئیجمالییەكان ( گشتی یەكان) كە قورئان، و سوننەت، و ئیجماع، و قیاسە، (التي يتوصل المجتهد بها)، ئەو دەلیلانەی كە بە هۆیەوە، موجتەهید دەتوانێت بگات، بەوەی كە (ألى استنباط الفقة)، فیقهـ دەربهێنێت، یان وەربگرێت، (أی: استنباط الاحكام الشرعية العملية، من ادلتها التفصيلية)، ئەم ڕستە تەفسیری ئەوەی پێشەوە دەكات، و دەڵێت: واتە، وەرگرتنی حوكمە شەرعیە عەمەلیەكان، لە دەلیلە تەفصیلییەكانەوە

جا لێرەدا دەبێت، ئەوە بزانین، كە هەندێ لە زانایان، (ادلة ی فقهی اجمالی) بە (اصول الفقه) دەزانن، بەلاَم هەندێكی تر، دەڵێن، بوونی عیلم بە (ادلةی فقهی اجمالی)، ئەوە ئوصولی فیقهە.

(فائدة اصول الفقه): سودی زانستی ئوصولی فیقهـ:(أن اصول الفقه)، بێگومان زانستی ئوصولی فیقهـ، (علم) زانستێكە، (جليل القدر) بە نرخە، (بالغ الاهمية) زۆر بە پێز، و بە بایەخە، (غزير الفائدة)، زۆر زۆر بە سوودە، (فائدتە)، سوودەكەی (التمكن من حصول قدرة)، توانای ئەوەت ئەداتێ كە بتوانی بە هۆی ئوصولەوە، (استخراج الاحكام الشرعية)، حوكمی شەرعی دەربهێنیت، ( من أدلتها )، لە دەلیلە ئیجمالییەكانەوە.

لێرەدا پێویستە بزانرێت کە، (الاحکام الشرعیة العملیة) واتە: ئەو فەرمانانەی کە لە سەر، کار و کردەوەکانی مرۆڤ دراون، وەك (واجب، حرام، مباح، مندوب، مَکروه.....)، و هەروەها حوکمە وەصفییەکانی، وەك:(السبب، المانع، الشرط، بطلان، الصحة)، کە حوکمی وەصفیی، بە مانای ئەو کار، و کردەوانە دێت، کە بەستراون، بە بڕیار، و فەرمانی ترەوە.

بەلاَم (الادلة التفصلیة)، بریتیە لەو بڕیار، و حوکمە تایبەتەی کە لە سەر ڕووداو، یان حوکمێکی تایبەت هاتبێ، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: (و لا تقتلوا نفس التی حرم الله .... الاسراء ـ ٣٣)، کە لەم ئایەتەدا موجتەهید یان قاضی دەتوانێت، ئەو حوکمە هەڵبهێنجێت، کە کوشتنی بە ناحەق حەرامە.

وە هەروەها دەبێت، بزانرێت، کە ووشەی (اجمالی)، واتە: ڕوونکردنەوە، نەك ووردەکاری کردن، بۆ نموونە، کە دەڵێین: بەڵگەمان قورئانە، واتە: کیتابە، ئەمە بەڵگەیەکی ڕوونکەرەوەیە، بەلاَم کە دەڵێین: تەفصیلی، واتە (جوزئی) ئەمەیان ووردکردنەوەیە، بۆ وێنە، کە دەڵێین: فلاَن ئایەت، ئەمە بەڵگەیەکی تەفصیلییە، یان وەك دەڵێین: بەڵگەمان سوننەتە، ئەوە بەڵگەیەکی ئیجمالییە، بەلاَم کە ووتت: فلاَن (حەدیث)، لێرەدا بەڵگەکە، دەبێتە بەڵگەیەکی تەفصیلی.

لێرەوە ئەو دوو ڕەهەندە جیادەبنەوە، و دەردەکەون، کە زانستی (فیقهـ) پێویستی بە دەلیلی تەفصیلییە، بەلاَم ئوصول، لە بەڵگە ئیجمالییەکان دەکۆڵێتەوە، و کاریان لە سەر دەکات[٥]!

---

٥. شەرحی کوردیی، د. عبداللطیف، سەلەفی/ چوارقوڕنە، لە سەر ﴿الاصول من علم الاصول﴾ی، الشیخ محمد بن صالح العیمین،(گۆڕی پڕ نوور بێت)، بە کاسێت.

فالاصل ماینی علیه غـیـــره والفرع ضده، فـهـذا أمره

والفقه اَن یُعرف حکم الشرع العملیٌ مـن الدلیل المرعیٌ

---

پێناسـەی ئوصـولی فیقهـ: ( بأعتبـاره مرکبـا اضـافیا)، واتـە، بـە پێـی ئـەوەی کـە پێکهاتبێت، لە (أصول +فقه)، پێویستە، ئەوە بزانرێت کە (الاصول) کۆی (أصـل)ـە، وە (أصل)یش، واتە، ئەوەی کە شتێکی تر لە سەری بنیات دەنرێت، بـەلاَم لـە زاراوەدا (اصطلاحاً)، لە لای شەرعناسان، چەند مانایەکی هەیە، لەوانە:

- بە مانای (القاعدة الکلیة) دێت، وەك: (الاصل، أن الفاعل مرفوع).
- بە مانای (الدلیل)، وەك: (الاصل، فی وجوب الصلاة هو الکتاب).
- بە مانـای (الـراجح)، وەك: (أذا تـردد الـنص بـین الحقیقـة والمجـاز ، فالاصـل هـو الحقیقة).
- بە مانای (المستصحب)، وەك: (طهارة الماء، هی الاصل).
- بـە مانـای (القاعـدة المـستمرة)، وەك: (اکـل المیتـة للمـضطر خـلاف الاصــل)، خواردنی گۆشتی مردارەوبوو، بۆ ناچار، پێچەوانەی ئەصڵە.
- بە مانای (المقیس علیه)، وەك: ( الجد یحجب الاخـوة فـی المـیراث، و الاصـل فـی ذالـك هـو الاب)، لـە لای زانایـانی مەزهـەبی حەنـەفی (بـاپیر)، مـەنعی بـرا دەکـات، لـە میراتدا، کە بەراوردیان کردووە، بە باوك!

بەلاَم ئێمە لە باسکردنماندا لە سەر ئوصولی فیقهـ، مانای دووەمین وەردەگرین، کە بە مانای (دەلیل) دێت، دواتریش بۆ قسەکردن لە سەر فیقهـ، دەبێـت، بزانرێـت کـە بـە مانای (الفهم: تێگەیشتن و حاڵی بوون) دێت، و لە زاراوەی شەرع ناسانیشدا، واتە:(هـو العلم بالاحکام الشرعیة العملیة، من الادلـة التفـصیلیة)، ئـەو زانـستەیە کـە هەمانـە، بـە ئەحکامی شەرعی عەمەلی، لە بەڵگە تەفصیلییەکانەوە.

- لێرەدا دەبێت، مانای (الدلیل – بەڵگەش)، بە ووردی بزانین کە:
- دەلیل : لەزماندا، بە مانای (المرشد: ڕێبەر) دێت.

– و لە زاراوەدا، ئەوەیە کە (ما کان لە دور فی استنباط الحکم الشرعی)، هەر شتێ ڕۆڵی هەبێت، لە هەڵهێنجانی حوکمە شەرعییەکاندا، پێی دەگوترێت، دەلیل.

* دەلیلە شەرعییەکان، یان:

– (أصل)ین.

– یان (تەبیعی)ین.

دەلیلی ئەصڵی: ( هو منشیء الحکم، أی، لا یوجد الحکم بدونە، و هو الکتاب والسنة: بریتیە لە داهێنەری حوکم، واتە، بە بێ ئەو حوکم دروست نابێت، وەك، کتاب، و سوننەت.

دەلیلی تەبیعی: ( هو الکاشف للحکم، لیس بالضرورة، أن لا یوجد الحکم بدونە، بل یوجد الحکم، دون أن یکون ظاهراً لنا، و هو کالاجماع، و القیاس، و سائرالادلة: بریتییە لە ئاشکراکردنی حوکمەکە، واتە، ئەم حوکمەکە درووست ناکات، بەڵکو حوکمەکە خۆی هەیە، بەڵام ئەم ئاشکرای دەکات، وەك، ئیجماع و قیاس و دەلیلەکانی تر.

– بزانە کە دەلیلی شەرعی، سێ جۆرە:

١– الدلیل النقلی: دەلیلی نەقڵی:

ئەوەیە کە پشت بە گێڕانەوە (نەقڵ) دەبەستێت، وەك:

( کتاب ، سنة ، اجماع ، عرف ، مذهب الصحابی).

٢– الدلیل العقلی : دەلیلی عەقڵی :

ئەوەیەکە پشت بە عەقڵی ساغ دەبەستێت، وەك، (المصالح المرسلة، الاستقراء، الاحتیاط، القول بالبراءة).

٣– الدلیل لمرکب من العقلی والنقلی:

دەلیلی تێکەڵ لە عەقڵ و نەقڵ:

واتـە، هەنـدێکی لـە نـەقڵ وەرگیرابێـت، و هەنـدێکی لـە عـەقڵ وەرگیرابێـت، وەك: (قیاس ، الاستحسان ، الاستصحاب ، سد الذرائع ، شرع من قبلنا).

والـــحـكـــم أن يعاقبن مُجتَنِبُه فواجبٌ، أَوْ فاعـــــل فَلَقَبُه
مـحرَّمٌ، أَمَّا إِذا أُثـيـــبـــا فاعــــلُهُ، فَندبٌ، أُستُطيبا
أو تاركٌ لَهُ، فمكروهٌ صُـــراح أو لا، و لا، فعندهم، هو المباح

## الأحكام:

لێرەدا دێتە سەر باسی حوکم:

(الاحكام: جمع حكم، و هو لغة: القضاء) ئەحكام، جەمعی حوکمە، و لە عەرەبیدا بە مانای "قضاء: مەنعکردن: بەرگری لێکردن" دێت ، و بۆیە حاکم، بە قازی ناسراوە، لە ناو خەڵکیدا، چونکە مەنعی خەڵکی دەکات، لە غەیری ئەو شتەی کە فەرمانی پێکردووە، وە حوکم، بەم شێوازەش باسکراوە، (حكم: لغة: أثبات أمر، لامر، أو نفيه عنه)، و بریتیە لەوەی کە ئیسباتی شتێك، لە سەر شتێك بکەیت، و یاخود نەفی شتێك، لە سەر ئەو شتە بکەیت، بۆ نموونە: (زيد قائم، و عمرو ليس بقائم)، کە ئیسباتی ڕاوەستاویی، لە سەر زەید کردووە، و نەفی ڕاوەستان لە سەر عەمر کراوە، و لێرەدا پێویستە بزانرێت، کە حوکم سێ جۆرە: (حكم عقلي، حكم عادي ، (تجريبي)، حكم شرعي)، (و اصطلاحا): وە لە زاراوەی زانایانی ئوصولدا: (ما أقتضاه)، واتە: ما طلبە، ئەوەی داوای دەکات، (خطاب الشرع ) ئەوەی خیتابی شەرعی داوای دەکات.

خیطابی شەرع مەبەست: خیطابی وەحییە، ئیتر کیتاب بێت، یان سوننەت، (المتعلق بأفعال المكلفين): ئەو خیطابەی کە پەیوەستە بە کار، و کردەوەی ئەوانەی کە گەیشتوونەتە سنوری تەکلیفی شەرعی.

(من طلب، أو تخيير، أو وضع)، ئیتر لە ڕووی تەڵەبەوە بێت، یان (تخيير: سەرپشك کردن)، یان وەصفەوە ! کە دەچینە سەری، أنشاءالله.

(فالمراد بقولنا): مەبەست لەو گوتەیەمان، (خطاب الشرع)، کە خیطابی شەرع بوو، قورئان، و سوننەتە، ئیمامی شەوکانی لە پێناسەی حوکمدا دەفەرموێت: ( هو خطاب

الله تعالى، المتعلق، بافعال المكلفين، بالاقتضاء، أو التخيير)، جا لێرەدا شێخ عوثەیمین رحمه الله، وای داناوە، کە حوکم بریتیە لە خودی تەڵەب، و تەخییر، و وەضع، کە لە خیتابی شەرعییەوە وەرگیراوە، کە ئەمە پێناسەی حوکمە، لە لای (فقهاء: شەرعزانەکان)، بەڵام ئیمامی شەوکانی، وای دانا، کە حوکمی شەرعی، بریتییە لە خیطابی خوا، کە خودی خیتابەکە، بریتییە لە حوکمی شەرعی، کە ئەمە پێناسەی حوکمە لای زانایانی ئوصول.

( و المراد بقولنا)، وە مەبەست لەو گوتەیەمان: (المتعلق بأفعال المكلفين): پەیوەست بە کاروکردەی ئەوانەوە کە موکەللەفن، ( ما تعلق بأعمالهم سواء كانت قولا، أم فعلا، أيجادا، أم تركا)، ئەوەیە کە پەیوەستە بە کردەوەی موکەللەفەکانەوە، ئیتر گوفتار بێت، یان کردار، بە کردنیان بێت، یان بە تەرککردنیان، چونیەکە ! (فخرج بـه): بە هۆی ئەم پێناسەوە، ئەوەی لێدەرچوو، (ما تعلق بالاعتقاد)، ئەوەی کە پەیوەستە بە عەقیدەوە، لە ناسینی زاتی خودا، و شتەکانی تر، (فلا يسمى حكما)، ئەمانە بە حوکم حیساب نین! (بهذا الاصطلاح)، بە گوێرەی ئەم لێکدانەوە، و ئیستیلاحە بێت، کە باسمان کرد، لێرەدا جێگای خۆیەتی کە بزانین (طلب)، دوو جۆرە: – طەلەبی فیعل.

– طەلەبی تەرك.

(تەخییر)، بە مانای ئەوەیە، کە خۆت سەرپشك بکەیت، لە نێوان کردنی کارێك و نەکردنیدا، (وضع): ئەوەیە کە خیطابی شەرعی شتێکی داناوە، بە نیشانە، و عەلامەت، بۆ شتێکی تر، "بۆ حوکمێك، بۆ نموونە" ئەو شتەی داناوە، بەسە بۆ ئەو حوکمە، واتە، داینـاوە بە شەرعیی ئەو حوکمە، وە بە عەلامەتی سیحەت، یان فەسادی، ئەو حوکمە، ئینجا بزانە کە (أیجادی قول) وەك ئەم ئایەتە ( قولوا امنا بالله: بڵێن ئیمانمان بە خوا هاورد)، کە داواکراوە ئەم گوتەیە بگوترێت، و (أیجادی فعل)، وەك: ( و أقيموا الصلاة) نوێژ بکەن، کە داوا کراوە، کرداری نوێژ بکرێت، وە

تەرکی قەول، وەك: (و لا تقولوا علی الله الا الحق)، کە داواکراوە، تـەرکی ئـەو گوتەیـە بکرێت، کە بۆ خوا بگوترێت، و ڕاست نەبێت، وە تەرکی فیعل وەك: ( و لا تقربوا الزنـا) نزیکی زینا مەکەون، کە داواکراوە تەرکی کارێك هەیە، بیکەن، کە زینایە !

وە بزانە: کە لە (عَمَل، و فعل )دا، عەمەل شومولی تر، و گشتگیرترە ، چـونکە (لان العمل یشمل القول، و الفعل: عەمەل، کردار، و گوفتاریش دەگرێتەوە)، کما قال تعـالی : ( الـذین امنـوا وعملـوا الـصالحات)، کـە (عملـوا الـصالحات)، لـە قـسە، و کـرداریش دەگرێتەوە، و بزانە کە مەسائیلی ئیعتیقادیی، وەك: (شهد الله أنه لا الـه الا هـو)، و ( و هوالسمیع البصیر)، ئەمانە پەیوەستن بەزاتی خواوە، بۆیـە لای زانایـانی ئوصـول، بـە حوکمی شەرعیی حیساب ناکرێن!

(المکلفین: ما من شأنهم التکلیف، فیشمل الصغیر، و المجنـون)، خـاوەن تـەکلیفات ئەوانەن، کـە ئـەهلی تـەکلیفن، ئـەم تەکلیفـە منـداڵ و شـێتیش دەگرێتـەوە، ئەمـە لـە ئەصڵدا وایە، بەڵام مانع دروست بووە، تا ئەو مانیعە،

هەبێت، حوکمیان لە سەر نییە، کە ئەو مانیعە، نـەما، دەبنـەوە، بـە ئـەهلی تـەکلیف، دەنا لە ئەصڵدا، ئەهلی تەکلیفن، مادام ئینسانن، کما فـی الحـدیث: (رفـع الحکم عـن الثلاثة: عن النائم حتی یستیقظ، و عن الصغیر، حتی یکبر، و عن المجنون، حتی یعقل)، رواه أحمد، سێ کەس تاوانیان لەسەر نییە، خەوتوو، منـداڵ، شـێت، کەواتـە لـە سـەر ئەو مانیعانە، لە سەریان نییە، دەنا کە مانیعەکان نەمان، حوکمیان لە سەر دەبێت.

(من طلب الامر، و النهی سواء، علـی سـبیل الالـزام، أو الافـضلیة)، لـە داواکردنـی کارێك یان نەهی کردن، لە کردنی، چونکە ئەو داواکاری، و نەهییە، لە ڕووی ئیلزامـەوە بێت، یـان لـە ڕووی ئـەفـضەلیەتـەوە، "ألـزام": واتـە دەبێـت، هـەر بکرێـت، یـان هـەر نەکرێت، أفضلیة: باشتروایە، کە بکرێت، یان باشـتر وایـە، کـە نـەکرێت، لێـرەدا دەبـێ بزانین، کە ئەمری ئیلزام، بۆ واجب بوونە، و ئەمری ئەفزەلیەت، بۆ موستەحەب بوونـە،

باشتر، و جوانتر، و چاکتر وایە، و نەهی ئیلزام، بۆ تەحریمە، و نەهی ئەفزەلیەت، بۆ کەراهەتە.

(أو تخییر المباح)، التخییر: مەبەستمان پێی موباحە، واتە، لە زاتی خۆیدا سەرپشکی، کە بیکەی، یا نەیکەی، بۆ نموونە، (حل لکم صید البحر)، ڕاوی دەریا حەڵاڵە، ئەتوانی بیکەیت، و ئەتوانی نەیکەیت، ئەمە لە زاتی خۆیدا، بەڵام ئەگەر هاتوو، کاسپی نەما، جگە لە ڕاوی دەریا، یان خواردن نەما، جگە لەوەی کە تۆ لە ڕاوی دەریاوە دەستت دەکەوێت، لێرەدا دەبێتە واجب یان، ئەو کارەت کە ڕاوی دەریایە، نزیك بوو، لە خراپەکارییەوە، شوێنێك بوو، خراپەی زۆری تیادا دەکرا، لێرەدا دەبێتە حەڕام، لە سەرت بچی بۆی، ئیللا لە حاڵەتی ناچاریدا نەبێت، کە دیسانەوە حوکمەکەی دەگۆڕێت!

( أو وضع)، یان لەڕووی دانانەوە بێت ، ئەمەیە (الصحیح والفساد، ونحوهما کالشرط والمانع، مما وضعه الشارع من علامات وأوصاف للنفوذ والالغاء):

وضع: صەحیح بوونی ئەو کارە یان فەساد بوونییەتی، یان هاوێنەکانی صەحیحی، و فەسادی، وەك: شرط، مانع، ئەوانەی کە شەرع دایناوە بە نیشانە، و وەصف گەلێك کە ببنە هۆی تەنفیزکردنی حوکمەکە، یان ئیلغاکردنەوەی، بۆ نموونە، کە بەیع و موعامەلەیەکت کرد، صەحیح بوو، ئیتر ئەو بەیعە صەحیح بووە، بۆی هەیە، تەنفیز بکرێت، لە لایەن هەر دوو لاوە، و بۆ نموونە، کە بەیعێك، کە فاسید بوو، بەوەی کە شەرتێ یان هەر شتێکی تر، لەکڕیار، و فرۆشیاردا نەهاتبووە دی، بووبوویە هۆی بەتاڵ کردنەوەی بەیعەکە، ئەوە ئەو کاتە، ئەو بەیعە ئیلغا دەبێتەوە.

- لێرەدا دەبێت بزانرێت، کە حوکم دوو جۆرە:

( تەکلیفی)، و ( وەضعی).

تەکلیفی: ئەوەیە کە (طلب و تخییر ) دەگرێتەوە، وە لەم حوکمەدا، ئەرك خستنە سەری تیادایە، بەڵام لە حوکمی شەرعی وەضعیدا ئەرك خستنە سەری تێدا نییە، و نە طەلەبە، و نە ( تخییر )، و پەیوەستە بە ناوەڕۆکی کارەکەوە.

## ( أقسام الاحكام الشرعية ): بەشەكانی ئەحكامی شەرعی:

( تنقسم الاحكام الشرعية)، حوكمە شەرعیەكان دابەش دەبن، بۆ دوو بەش: (تكليفية، و وضعية):

( فالتكليفية خمسة)، لێرەدا دەچینە سەر باسی حوكمە تەكلیفییەكان، كە پێنج حوكمن، بۆیە فەرمووی: تەكلیفی، چونكە، ( طلب مافيه مشقة، و لكن مستطاع)، ئەو داواكاریەیە، كە ناڕەحەتی تیادایە، بەلأم لە توانای مرۆڤ بەدەر نییە، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ( لا يكلف الله نفسا الا وسعها)، بە هەر حاڵ، پێنج بەشەكەی حوكمی تەكلیفی ئەمانەن: ( الواجب و المندوب و المحرم و المكروه و المباح)، پاش ئەمە دێتە سەر شەرحكردنی دانە بە دانەیان:

- واجب: لە زمانی عەرەبیدا، بە مانای الساقط: كەوتووە، اللازم: پابەند بوونە، وەك لە فەرموودەدا هاتووە، ( و المغرب اذا وجبت الشمس: أی: اذا سقطت)، وە ڕستەی ( فاذا وجبت جنوبها)، واتە: سقطت، وە كە دەگوترێت، (الزمت الناقة: ووشترەكە كەوت)، واتە، پابەند دەبێت، بەو جێگەیەوەی كە تێیدا كەوتووە.

- ( و اصطلاحا)، وە پێناسەی واجب لە زاراوەی زانایانی ئوصولدا، (ما أمر به الشارع)، ئەوەیە كە شەرعی شەریفی ئیسلام، كە سەرچاوەكەی وەحییە، فەرمانی پێكردبێت، ئەو فەرمان كردنە دەبێت، لە ڕووی پابەند بوونەوە بێت، وەك: فەرمان كردن، بە كردنی پێنج نوێژە فەرزەكە.

- ( حكم الواجب): حوكمی واجب، كردن، و نەكردنیی، لە شەرعدا ئەوەیە، (و الواجب يثاب فاعله، أمتثالا، و يستحق العقاب تاركه)، وە واجب هەر كەسێك بیكات، لە بەر خوا پاداشتی خۆی وەردەگرێت، واتە لەبەر خوا كردبێتی، نەك لە بەر ڕیا، و شتی

تـر، وە تـەرك كـاری، واجبـیش، موسـتەحەقی سـزایە، لـە لای خـوای گـەورە، خـوای پەروەردگار پەنامان بدات!

( ويسمى : فرضا، و فريضة، و حتما، و لازما)، واجب جگە لە خودی ناوەكەی .. : فرض، و فريضة، و حتما، و لازما.. يشی پیٚ دەگوترێت[٦].

– محرم : ( أقتضى الترك لشيىء، أقتضاءاً جازمـا، بـأن لم يجـوز فعلـه، فتحريم ......)، هەر وەك لە (جمع الجوامع)دا، فەرموویەتی:

كـە شـەریعەت شـێلگیرانە، داوای دووركەوتنـەوە، لـە كردنـی كارێـك بكـات، وەك، ئازاردانی دایك، و باووك، و جگە لەمەش ( محظور ،و ممنوع) يشی پیٚ دەگوترێـت، كـە ئەنجامدەرەكـەی تووشـی سـزا دەبێـت، وە ئـەو كەسـەی كـە لێـی هەڵـدێت، پاداشـت دەدرێتەوە، وە كردنی ئەو كارەخۆی لە خۆیدا تاوانە، وەك زیناكردن، كە خوای گەورە فەرموويەتی: ( و لا تقربوا الزنـا.... الاسـراء ٣٢)، و حـەرامیی مـارەكردنی كەسـانی حەڵاڵ، لە شەرعدا، وەك دەفەرموێ: ( حرمت عليكم أمهـاتكم و بنـاتكم.... سـورەتی النساء ٢٣)، ئەم حوكمی حەڕامكراوەش، كەسی پێگەیشتوو، باڵغ، و ژیر دەگرێتـەوە، كە فەرمانی وەك چۆن پێكراوە، كارە، واجبەكان ئەنجام بدات،

دەبێـت لـە كـارە حـەرام، و ڕیٚ لێگیراوەكـانیش دوور بكەوێتـەوە، وە زانايـانیش (محرم)یان، كردووە، بە دوو بەشەوە:

المحرم لذاته : ئەوەی كە شەرع، لە خودی خۆیدا حەرامی كردووە، چـونكە خـودی ئـەو كـارە حـەرام و نادرووسـتە، وەك كڕینـی شـتی مـردارەوە بـوو، يـان مـارە بڕینـی كەسانیٚ كە خوا حەرامی كردوون.

---

٦ الاصول من علم الاصول، نووسینی: عەللامە شێخ موحەممەد صالح العُثَيمين، بە شەرحی مامۆستا مەلا عبد اللطيف ئەحمەد، ( لە كاسێتدا).

المحرم لغیره : ئەوەیە کە لە خودی خۆیدا دروستە، بەلاّم خراپ، و نا پەسەندە بۆ غەیری خۆی، بۆیە حەرام کراوە، وەك ئەوەی کە کەسێك داوای ژنێکی کردبێت، پێش سەرگرتنی کارەکەی، کەسێکی تریش بچێتەداوای، و مامەڵە بکات، بە سەر مامەڵەکەی ئەودا!

* المندوب: ئەوەیەکەشەریعەت فەرمانی پێکردبێت ، بەلاّم لەسەرشێوازێکی حەتمی نا.... بەڵکوکردنی باش بێت وەپاداشتی لەسەربێت ئەنجام نەدەریشی سزانادرێت ، وەك خوای گەورەدەفەرموێت: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا تَدَايَنتُمْ بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى فَاكْتُبُوهُ وَلْيَكْتُبْ بَيْنَكُمْ كَاتِبٌ بِالْعَدْلِ وَلاَ يَأْبَ كَاتِبٌ أَنْ يَكْتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ اللَّهُ فَلْيَكْتُبْ ...... البقرة-٢٨٢)، کەلێرەدائەم فەرمانە بۆ ووجوب نییە، بەڵکو (مندوب) بەبەڵگەی ئەونیشانە یەی کەلەم ئایەتەداهاتووە دەفەرموێت : ( فأن أمن بعضکم بعضا فلیؤد.....) کەئەمەش بۆقەرزارێکەمتمانەی هەبێت ، نووسینی ناوێت .

بەشەکانی مندوب :

أ : ئەومەندوبەی کەداواکراوە ، ئەنجام بدرێت وەجەختیش لەسەرکردنەکەی وئەنجامدانیشی کراوە کەئەمەش (سونەتی مونەکەدەیە)، یاخود سوننەتی (هدی) لەمەشدا، ئەوسونەتانەی کەبەئەنجامدانیان واجباتە ئاینیەکان

بەرێك و پێکی تەواو دەکرێن ، وەك : بانگدان و نوێژی بەجەماعەت کەئەوکەسەی ئەمانەناکات لۆمەدەکرێت بەلاّم سزانادرێت .

ب : ئەومەندوبەی کەئەنجامدانی شەرعیە لە سەرکردنی پاداشت وەردەگرێت ولەنەکردنیشی نەسزادەدرێت ، نەلۆمەدەکرێت ، وەك کردنی چوارڕکاتی نوێژی سوننەت پێش نوێژی نیوەڕۆ، و عەسر.

ج : مندوبی زیادە: ئەویش وەك سونەتە عادەتیەکانی پێغەمبەر ( درودی خوای لێبێت ) وەك خواردن وخواردنەوە لەسەرئەوشێوازەی کەپیادەی کردووە ، وەشێوازی جل و بەرگ لەبەرکردن و زۆرشتی تری پێغەمبەری خوا ﷺ، کە بە کردنیان ئەو کەسە

زیاتر خۆی بە کار، و کردەوە، و ئەخلاقی پێغەمبەر ﷺ دەڕازێنێتەوە، وپاداشت وەردەگرێت، بەلاَم بە نەکردنی سزا نادرێت وخراپەی لەسەرحیساب ناکرێت ، وە بزانە کە مەندوب ( سنه ، مسنون ، مستحب ، نفل ) یشی پیێ دەوترێت .

*المکروه : ئەوەیەکەشەریعەت فەرمانی دابێت ، بەدورکەوتنەوە لێی ، بەلاَم فەرمانەکەحەتمی نەبێت کەدەبێت هەردورکەوێتەوە لێی وەك : خواردن بەدەستی چەپ ، یاخودبەکارهێنانی دەستی چەپ بە شێوەیەکی گشتی لەکاروباردا کە شەرع فەرمانی داوە، کە بە دەستی چەپ نەکرێت ، بەلاَم مەبەست لەم فەرمانەحەرام بوونە نیە ، لەگەلْ ئەوەشدا کەسێك پێی هەستێت سزانادرێت ، بەلاَم کەسێك لێی دوردەکەوێتەوە وبەچەپ کارنەکات ، پاداشت وەردەگرێت وەك پێغەمبەر (درووودی خوای لێبێت ) کەبەردەوام جگەلەهەندێ حالەتی تایبەتی دەستی ڕاستی بەکارهێناوە، لە کاروباردا.

*المباح : ئەوکارەیەکە هیچ فەرمان(أمر)، و نەکردن(نهی)ییەك پەیوەندی پێیەوەنەبێت ، وەك خواردن لەشەوی ڕەمەزاندا کە موباحە بەم هۆیەشەوە ئەنجام دەرەکەی نەپاداشت و نەسزاوەردەگرێت، لە سەری، هەروەك (حلال)، و ( جائز ) یشی پیێ دەوترێت ، لەباسی ( مباح ) دایە کەسەرپشك کردن (التخییر) دێتە ئاراوە ، کە ئەویش سەرپشك کردن(التخییر) ، یان سەر پشك نەکردنی مرۆڤە لە نێوان کردن یان نەکردنی کارێکدا، بە بێ هیچ پاداشت، یان سزا، یان لۆمە یان هاندانێك ، دەبێ لێرەدائەوەش بزانرێت

کە (أن الاصل فی الاشیاء الاباحة) ئەصلْ لەشتەکاندا حەلاَلْ بونیانە ،دواترشەرع بڕیاری حەرام و فەرمانەکانی تریان بەسەردا دەدات وەك لەم ئایەتە پیرۆزەدا خوای گەورە دەفەرموێت ( الیوم أحل لکم الطیبات .... المائده –٥ ) یان ئایەتی ( لاجناح علیکم فیما عرضتم ..البقرة– ١٧٣ ) یان ( لیس علی الاعمی ..... النور ٦١ ) وەچەندەهائایەتی پیرۆزی تر کە ئەوە دەسەلمێنێت خوای پەروەردگار لە بەخشندەیی و گەورەیی خۆیەوە ڕوخسەتی

بە مرۆڤ داوە، کە زۆر شت بکات، و بۆی موباح بێت، هەندێ لە زانایانی ئوصول ڕەخنەیان لەوەگرتووە کە (مباح ) سەربەئەحکامی تەکلیفی بێت ، چونکەلەکردن و تەکردندا یەکسان بوون ئیترچ تەکلیفێکی تێدایە ؟ بەلاّم لەڕاستیدا (أباحة) دەبوایە سەربەحوکمی تەکلیفی بوایە چونکەزۆرجار شتی موباحیش دەبێتە واجب لەسەربنەمای ( کل مایتوقف علیه الواجب فهوواجب ) چونکە جاری واهەیە کاری موباح دەبێتە ( واجب ) یان بەلایەنی کەمەوە دەبێتە ( مندوب ) وەك خەوخواردن و ئسراحەت و پاك و خاوێنی ، چونکە بەردەوامی ژیانیان پێوە بەسراوەو بەتەواوی ئیهمال کردنیان ژیان دەکوژێت ، هەرچەندلەخۆیاندا موباحن !

وأن به اعتُدَّ، و قـــد تعلّقا بـــه النفوذ فصحيح ارتقا
وغيره الباطل حـد العـــلم معرفـة المعلوم ، كن ذاحزم
خلافه جهـــــل وأن توقفا على نظـر ، مكتسب فلتعرفا
وغيره يدعى الضروری النظر فكرُك في المطلوب ذاقداشتهر
ثم الدليل المرشــــد المعتمد والظـــن دزك راجح يعتضد
والوهم أدراكــك للمرجوح والمستوى شك ، بلا رجوح

هەرلەچوارچێوەی ( الاحكام الوضعية ) دا . دێتەسەرباسی ( الصحة والفساد ) ، ( العلم ، الجهـل ) ، ( العلـم الـضروری ، العلـم النظـری ) ، ( الجهـل البـسيط ، الجهـل المركب ) ( ظن ، وهم ، شك ) .

ئـەحكامی وەضـعی : ئەوحوكمانـەن كەشـەرع داینـاون ، بـەوەی كەئـەنجام بـدرێن وەئەنجامدانیان جێگیرو دروسـتە یـان دووربكەوینـەوە لێیـان ، وەجـێ بـەجێ نـەكرێن ، لەوانەش ( الصحة ، والفساد ) .

الصحة : لەزماندا بەمانای (السليم من المرض : ساغ و دوور لـە نەخۆشـی) دێـت، وە لە زاراوەدا ئەوەیە كە كەسێكی موكەلەف هەستێت بەكارێكی پەرستش یان موعامەلات لەسنوری شەرعدا ، وەسەرجەم پایەو مەرجەشەرعیەكانی تێدابێت،ئەوەشـەریعەت دان دەبێت بەدروستی كارەكە، وەبەپێچەوانەوە ( فاسد و باطل ) ناتەواوە دەبێت ئـەوكارە هێندەرەچـاوی سـنورو مەرجەشـەرعیەكانی تێـداكرابێت ، كەبـەكردنی لەسـەر گـەردنی كەسـە (مكلـف)ـەكە لا بـچێت، وەك نوێـژێك كەبەسـەرجەم مـەرج وداواكاریەكانیـەوە ئەنجام بدرێت ، یان لەمامەڵەدا وەك كەسێك موڵكێـك ( كـەهی خـۆی بێـت ) هەڵسێت بەفرۆشـتنی و مـەرج و سـنورەكانی تیـادا ڕچـاوبكات ، بـەڵام كەڕچـاوی و مـەرج و سنورەشەرعیەكانی نەكرد دەبێتە ( فاسد ) ، وەك لەپەرستشدا،

کەهەڵسیّ بەبیّ دەستنویّژ نویّژبکات ، ئەو ( صحە ) ی نیەو ( فاسدە ) یان لەمامەڵەدا شتیّك بفرۆشی کەهی خۆی نەبیّت ، بەلاّم دەبیّت لیّرەدا ئەوبزانریّت کە ( البطلان ) و ( الفساد ) ، یەك مانایان هەیە لەلای جەماوەری زانایان ،وەدەڵیّن هەمووپەرستش یان مامەڵەیەك یان هەڵسوکەوتیّك کەچەندئەرکان یا چەندمەرجیّکی تیادا نەهاتبیّتەدی کە ( شەرع ) داوای کردوون ، ئەوە ( باطل ) و (فاسد)ـە، و هیچ بڕیاریّکی شەرعی لەسەربنیات نانریّت ، بۆنموونە شت فرۆشتن لە لایەن کەسی شیّتەوە (باطل)ـە، چونکە لەگەڵ کەسی فرۆشیار ( عاقد ) دا ، کەئەرکانیّکی مامەڵەکەیەگرفتی هەیە ، یان فرۆشتنی ماسی لەبەحرو شتی تۆپی و دیسان ( باطل )ـە، چونکە لەفرۆشتووە کەدا ، کەئەرکانیّکی مامەڵەکەیە گرفت هەیە ، بۆیەدروست نیە ، بۆیەئەم جۆرەمامەلآنە جگەلەووشەی (باطل) و (فاسد) یشیان بۆبەکاردیّت ،ئیترگرفتەکە لەئەرکانەدابیّت یان لە (شروط)دا، هەرچونیەکە، بەلاّم لیّرەدا حەنەفیەکان جیاوازیەکیان کردووە ، ووتویانە لەپەرستشەکاندا ئەگەر ڕوکنیّك لەئەرکانەکانی تیادا نەبوو ، بۆنموونە لەنویّژدا ڕکوع نەبات ، یان مەرجیّك لەمەرجەکانی تیّدانەبیّت ، وەك نویّژکردن بەبیّ دەست نویّژ ، ئەمە لەهەردوو ئەم حاڵەتانەدا بە ( باطل ) و ( فاسد ) یش ناودەبریّت ،هیچ بڕیاریّکی شەرعی لەسەر بنیات نانریّت ، بۆیە لای حەنەفیەکان (باطل)، و (فاسد)، لە پەرستشدا یەك مانایان هەیە، بەلاّم لەمامەڵدا کەبریتیە لەگرێبەست و هەڵوسوکەت کردنەکان ، ئەگەر ڕوکنیّك لەئەرکانەکانی نەهاتە دی ، ئەوە بە (باطل) ناوزەند دەکریّت ،وەبڕیاری شەرعی لەسەربنیات نانریّت وەك فرۆشتنی شمەك لەلایەن شیّتەوە یان فرۆشتنی شتی تۆپی و

مردارەوەبوو یان مارەکردنی کەسانی حەلآڵ کراو لەگەڵ زانینی حەرامیەتیەکدا ، بۆیە ئەگەر ئەرکانەکانی تیادا هاتەدی بەلاّم هەندیّ مەرج (شرط)ـی، تیّدا نەبوو، ئەوەبەفاسد ناودەبریّت ،هەندیّ بڕیاری شەرعی تیادا جیّگیردەبیّت ، بۆنموونە لەمارەبڕینی بیّ شایەتیدا ،ئەگەرهاتوو ڕۆشتەلای و جیماعی پیّکرد ، ئەوامارەی لەسەر

واجب دەبێت ، ( عدە ) ماوەی دیاری كراو دوای تەلاقدان و جیابوونەوە بباتەسەر ، هەروەها نەسیب دیاری دەكرێت ، وەك ڕەچاوكردنێكی چارەنووس ئەومنداڵەی لەنێوان ئەوژن و پیاوەدا دەكەوێتەوە ، هەرچەندە مامەڵەكەیان فاسد بووە ، بۆیە ( باطل ) لای حەنەفیەكان ئەوەیە كەگرفتەكە بگەڕێتەوە بۆڕوكنەكانی مامەڵەكە ،واتە بۆدەقی مامەڵەكە یان یان دوكەسی مامەڵەكار یاخود شوێنی مامەڵەكە ، بەلام ( فاسد ) ئەوەیە كەگرفتەكە بگەڕێتەوە بۆ بارودۆخ و شێوازی مامەڵەكە ، نەك بۆئەركانەكانی ، بۆیە ئەركانەكانی ساغن ، بەلام گرفت لەشێوازو ( أوصافە ) كانی دایە ، بۆیە بە ( فاسد ) ناوی ئەبەن ، بۆیە حەنەفیەكان بەكورتی ووتویانە ( فاسد ) ئەویە كەلەئەسڵداو لەئەركانەكانی دا درووستە ، نەك لە ( ئەوصافەكانی ) دا وە ( باطل ) ئەوەیە نەئەركانەكان و نەئەوصافەكانی دروست نەبن و نارەوابن ، ئینجاسەبارەت بەبوونی ( علم ) بەوئەحكامانە دەبێت بزانرێت كە ( العلم : أدراك الشيء ماهوعليه أدراكا جازما)، (علم): بریتیە لەهەست كردن بەبوونی شتێك بوشێوازەی كەهەیە ، وەئەوهەست كردن و زانینەش دەبێت پڕاوپڕ یەكلاكەرەوەبێت وەك : ( الكل أكبر من الجزء : شتی گشتی لەلق و چڵ و پۆپەگەورەترە ) و ( النية شرط في العبادة ) نیەت هێنان مەرجەلەپەرستش كردندا . بۆیە بەم پێناسەیە بێت.

زانینی كەم دەچێتەدەرەوە لەم پێناسەیەدا ، كەبە (الجهل البسيط) ناوبراوە ،بۆنمونە پرسیاربكرێت شەڕی بەدری گەورە كەی ڕویداوە ؟ بڵێیت نازانم!

وەهەروەها زانینی شتێك بەپێچەوانەی ئەوحاڵەتەی كەلەسەریەتی دیسان لەچوارچێوەی پێناسەی ( علم ) دەچێتەدەرەوە ،كەپێی دەوترێت ( الجهل المركب ) بۆنوونە پرسیاربكرێت ، كەی شەڕی بەدر ڕووی داوە بڵێت لەساڵی سێی كۆچیدا ! لەپێناسەكەدا كەوتمان (أدراكاً جازماً) ئەوەی كەهەستكردنێكی ناپڕاوپڕە، (غيرجازم)ە دەچێتەدەرەوە ، بۆنموونە بونی دوئیحتمالاتی تێ بكەوێت ، واتە سورنە زانین ، ئەوكارە چۆن و چۆن نیە بۆیەئەگەر لەودوئیحتیمالەدا دڵی چوو بەلای

یەکێکیاندا ئەوە پێی دەوترێت ( ظن ) و ئەوەی بەرامبەرەکەی بە ( وهم ) ناودەبرێت ، وەئەگەرلەنێوان هەردوئیحتیمالاتەکەدا یەکسان بوو دڵی بەلای هەردوکیاندا وەك یەك دەچوو ، ئەوە بە ( شك ) ناوزەند دەکرێت ، کەواتە لێرەوە ڕوون دەبێتەوە کە علم ، زانست بەهەرشتیێ بەم شێوازە یەکلای دەبێتەوە :

١-علم : زانینی شتێکە بەوشێوازەی کەلەسەریەتی وەك خۆی ، وەك (الكل أكبر من الجزء ) .

٢-الجهل البسيط: زانینی ناتەواوە ، وەك ( نازانم ) .

٣-الجهل المركب : نەزانینی هەرشتێکە ، و وابزانێ کەئەزانێ .

٤-ظن : زانینی شتێکی ناحەتمیە ، وەك بڵێیت (ئیحتمال دەکات ! ) .

٥-وهم : زانینی شتێکە ، لەگەڵ ئەوەدا کەئیحتیمالی پێچەوانەکەی لە سەر بێت.

٦-شك : زانینی هەرشتێکە لەگەڵ ئەوەدا کەئیحتیمالی حاڵەتەکەی تر لەسەریەکسان بێت .

لێرەشەوە دەکرێت ( علم ) بۆهەردووبەشی ( العلم الضروری ) و (العلم النظری) دابەش بکەین، وە لە پوختەی پێناسەی هەر دوو بەشەکەدا بنووسین :

العلم الضروري : ئەوزانستەیەکەدەبێت هەربزانرێت ، بەبێ تێڕوانین و بەڵگەهێنانەوەو بەدواداچوون ، وەك عیلم بوون بەوەی کە ئاگرگەرمە و محمد ( درودی خوای لێبێت ) پێغەمبەری خودایە .

العلم النظري : ئەوزانستەیەکەپێویستی بەتێڕوانین و بەڵگەهێنانەوە ڕاقەو بەدواداچوون هەیە ، وەك واجب کردنی نیەتهێنان لەنوێژکردندا[7].

٧. ﴿الاصول من علم الاصول﴾،للشيخ محمد بن صالح العثيمين، (گۆڕی پڕ نوور بێت)، مؤسسة الرسالة، ١٩٩٧.

## ( الادله المتفق عليها ، للاحكام الشرعية )

كتاب ، سنة ، أتفاق والقياس أدلة أربعة بـــــــــــلا النباس

---

ئەوبەڵگانانـــەی کەشەرعناســـان و ئوصـــولیەکان لەســـەری کـــۆکن کەسەرچـــاوەن بۆهەڵهێنجان و بەدروست خستنەگەڕی ئەحکامـەکانی شـەریعەت ، ئەمانـەن (قورئـان و سـونەتی پێغەمبـەرو ئیجمـاعی زانایـانی ئیـسلام وقیـاس ) ، وەئـەم بڕیـارە لەلایـەن هەموزانایانەوە پەسەندکراوە، وبێگومانەکە سەرچاوەی یەکـەم قورئانـەو سەرچاوەی سەرچـاوەکانە ، وزۆر شـتێکی ئاسایـشە کەیەکـەم سەرچـاوەبێت ، و ئەگەرلەقورئانـدا نـەبوو ئەوادەچینەسـەر سـوونەت ، چـونکە ڕاڤیـاری قورئانـە ، وەئەگەرلـەویش نـەبوو ئیجماع ( کۆڕا ) سەرچاوەی سێیەمە ، چونکە ئەویش لەقورئان و سـوونەت وەرگـیراوە ، وەئەگەر لێـرەش دەسـت نەکـەوت ، شـەرع دەسەوسـان دانەنیـشتووە ، وە ( قیـاس کـردن ) سەرچـاوەی چـوارەمە ، وەئــەم ڕیزبەندیـەش لەلایـەن زانایـانی ئیـسلامەوە پەسەندکراوە و کۆکن لەسەری بەم بەڵگانەی لای خوارەوە :

١-أن رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) قال لمعاذ و عندما أرسله الى اليمن ، كيـف تقضي اذا عرض لك قضاء ؟ قال : أقضي بكتاب الله ، قال: فـأن لم تجـد ؟ قـال: أقـضى بسنة رسول الله ( صلى الله عليه وسلم)

قال : فأن لم تجد في سنة رسول لله ولافي كتـاب الله ؟ قـال : أجتهـد برأيـي ولاألـو ، فضرب رسول الله ( صلى الله عليه وسلم ) على صـدره ، وقـال : الحمـدلله الـذي وفّـق رسول رسول الله ﷺ، لما يرضي رسول الله ﷺ.

واتـە : پێغەمبـەر ﷺ کاتێـك موعـازی کـوڕی جەبـەلی ڕەوانـەی یەمـەن کـرد ، پێـی فـەرموو کەپێـشهاتێکت هاتەبـەردەم ، بەچـی بڕیـاری لەسـەردەدەیت ، قـەزاوەتی پێدەکەیت ؟ ئەویش وتـی : بـەقورئانی پـیرۆز ، فـەرمووی ئەگـەر لەقورئانـدا نـەبوو ،

ووتی بەسونەتی پێغەمبەر و فەرمووی ئەگەرلەویشدانەبوو لەقورئانیشدانەبوو ؟ ووتی : بەڕای خۆم ئیجتهاد دەکەم جاپێغەمبەر ﷺ دای بەسەرسنگیدا وفەرمووی : سوپاس بۆئەوخوایەی کەنێردراوی پێغەمبەری ﷺمووەفە کرد ، بۆشتێ کەپێغەمبەر ﷺپێی ڕازییە.

٢-لە( مەیمون بن مهران ) ەوە دەڵێت : ئیمامی ئەبوبەکری صدیق ، ئەگەرکێشەوپێشهاتێکی بهاتایەتە بەردەم ، ئەوابۆچارەسەرەکەی سەیری قورئانی دەکرد . ئەگەر هەبوایەکاری پێ دەکرد قەزاوەتی لەسەردەردەکرد ، ئەگەرنەبوایەئەواسەیری سونەتی پێغەمبەری دەکرد ﷺ دەکرد ئەگەرلەسونەتیشدا هەبوایە قەزاوەتی پێ دەکرد ، وەئەگەرلەویش چنگی نەکەوتایە ، ئەواخەڵکی زانای کۆدەکردەوەو ڕاوێژی پێ دەکردن ، ئەگەرهەمووڕایان کۆببوایەتەوە لەسەرشتێك ئەوائەویش لەسەر ئەو ڕایەی ئەوان قەزاوەتی دەکرد ، هەرووەها پێشەوا ( عمری کوڕی خطاب ) یش هەربەم شێوازەکاری دەکرد.

٣-کاتێك ئیمامی عمر (شیرع)ی، نارد بۆ شاری کوفە، بۆ ئەوەی ببێتە والی پێی فەرموو : ئەوا قەزاوەت بکە بەقورئان ، ئەگەرلەقورئاندا نەبوو ، ئەواقەزاوەت بەسونەتی پێغەمبەرﷺبکە، ئەگەرلەویش چنگت نەکەوت ، ئەوائەوەی بۆت ڕونبوەتەوەو دەستت کەوتووە لەپێشەواسەر ڕاستەکانی

ئیسلام ، مەبەست لەخەلیفەکان و زاناکانە بەگوێرەی ئەو قەزاوەت بکە ، ئەگەرلێرەیشەوە دەستت نەکەوت ، ئەوا بە ( ڕا ) ی خۆت بڕیار بدەو ڕاوێژی کەسانی زاناو بۆخواسوتاویش بکە ، وەهەروەها، (عبدالله)ی، کوڕی مەسعودیش فەرمایشتی لەم شێوازەی هەیە . کەواتە لەم سێ بەڵگەیەو لەدەیان بەڵگەی ترو مێژووی پێغەمبەر ( درودی خوای لێبێت ) و هاوەڵان وخەلیفە ڕاشیدینەکان و زانایانی ئیسلام دەردەکەوێت ، کەئەوچوارسەرچاوەیە کۆکبوونی شەریعەتناسانی لەسەرە ، کەسەرچاوەو ڕیزبەندی بەڵگەن بۆقەزاوەتکردن و هەڵهێنجانی ئەحکام ، و ئەم ئایەتە

پیرۆزەش کەدەفەرموێت : ( یا أیها الذین أمنوا ..... النساء ٥٩ ) باشترین بەڵگەی ئەم ڕیزبەندیە یە ، کە ( أطیعوا الله ) قورئانە، و (أطیعواالرسول) سوننەتە، و (أولی الامر)، و ( فردوه)، ئاماژەیە بۆ (قیاس)!

## ﴿الكتاب﴾

قالوا الكلام عندنا أقسام — أمرونهي قسم استفهام
عرض تمن خبر حقيقة — ثم المجاز فأعرفن طريقه

---

لێرەدا دەچینە سەرپوختە باسێك دەربارەی ( الكتاب : قورئـانی پـیرۆز ) کەلـەلای زانایانی ئوصول بە ( الكـلام ) یـش ناودەبرێـت ، بەسـەرجەم بەشـەکانیەوە ، ( أمـر : فەرمان کردن ) ، ( نهی : رێگری کردن ) ، ( قـسم : سـوێندخواردن ) ، ( اسـتفهام : پرسـیاری ) ، عـرض : پـێش چاوخـستن ) ، ( تَمَـنٍّ : ئـاوات خواسـتن ) ، دواتـریش دابەشکردنی بۆ ( خبر ) و ( انشاء ) و (حقيقة ) و ( مجاز ) .

## باسی (الكلام )

کـەلام : لەزمانـە وانیـدا بەلـەفزە دەوترێـت ، کەلـەدەم دەردەچێت ، و بەتایبـەتی بۆئەوەی مانایەك بدات بەدەستەوە ، بەلاّم لەزاراوەدا بریتیە لـەو لـەفزەی کـەمانادارەو سودێکی هەیە ، وەك ( الله ربنا ) ( محمد ، درودی خوای لێبێت ، (نبینـا ) وەبەلایـەنی کەمەوە کەلام لەدووناو ( اسم ) دروست دەبێت ، وەك ( محمد رسول الله ) یان لەئیـسم و فیعلێـك دروسـت دەبێـت ، وەك ( اسـتقام محمـد ) ، وەکـەلام لـە ( کلمـە ، ووشـە ) پێکدێت ، کەووشـەیش بۆمانایـەکی ( تـاك ) بـەکاردەهێنرێت ، وە ( کلمـة ) یـش یـان اسمە یان فعلە یان حەرفە .

*ئیـسم : ئەوەیەکەلەخۆیـداماناداره‌و نەبەسـتراوە بـەهیچ کاتێکـەوە ، نـەڕابردوو نەداهاتوو نەئێستا ، وەدەبێتە سێ جۆر :

یەکەم : ئەوەیان کەمانای گشتی بـوون دەهێنێـت ، وەك (ألاسمـاء الموصـولة) کـانی ڕێزمانی عەرەبی .

دووەم : ئەمـە ڕەهـابوون ( الاطـلاق ) دەگرێتـەوە ، وەك درکانـدنی ( نکـرة ) لەڕستەی موسبەتدا،

سێیەم : ئەوەی خاوەنی تایبەتمەندیە وەك ( علم ) بەگشتی ،

*فعل : ئەوەیەکەمانادارەو بەستراوە بەیەکێك لەسێ کاتەکەوە ، ( ڕابردوو ، ئێستا ، داهاتوو)، (ڕابردوو: ماضی)، وەك فَهِمَ ،(ڕانەبردوو : المضارع) وەك يَفْهَـمُ ، ( داهـاتوو : أمر ) وەك إِفْهَمْ ، فعلیش زیاتر ڕەهابوون دەگرێتەوە .

*حرف : ئەوەیەکەلەخۆیدا مانا نادات بەدەستەوە ، بەڵام کەدرایە پاڵ شتی تر مانادار دەبێت ، وەك ( واو ، لام ، علی ، فاء ........... )

## ﴿ قورئانی پیرۆز ﴾

قورئان : بریتیە لەو فەرمایشت و کەلامەی کە خوای پەروەردگار ناردوتیە سەر پێغەمبەرﷺ، نوسراوەتەوە لەدوو توێی پەڕاو ( مصحف ) دا ، بەگێڕانەوەیەکی موتەواتیریدا گێڕاوەتەوەکە کەهیچ گومان و دوو دڵیەکی لەسەرنییە ، بەسورەتی ( فاتحە ) دەست پێدەکات و بە سورەتی ( الناس ) کۆتای دێت ، خوێندنەوەی بەپەرستش حیساب دەکرێت .

*جۆرەکانی ئەحکام لەقورئانی پیرۆزدا :

یەکەم : الاحکام الاعتقادیة : ( حوکمە بیرو باوەڕیەکان ) : ئەوانەن کەپەیوەندیان بەبیرو باوەڕ ( عقیدە ) وە هەیە ، وەك باوەڕبوون بەپایەکانی ئیمان ، وەك باوەڕ بەخوداو فریشتەکان و کتێبەئاسمانیەکان و پێغەمبەران و ڕۆژی دوای .

دووەم : الاحکام االخلقیة : ( حوکمە ڕەفتاریەکان ) : ئەوانەن کەلەڕەفتاری مرۆڤداڕەنگ بدەنەوە ، وە ئەو مرۆڤەوەصف بکرێت پێیان ، وەك ڕەفتارەباشەکانی وەك ( ڕاستی ، وڕاستاڵی ، وەبەردەوامی لەسەرچاکەکاری و هتد ............ ) .

سێیەم : الاحکام العملیة : حوکمە کرداریەکان : ئەوکارو کردەوانەن کەپێویستە جێ بەجێ بکرێن ، ولەپەرستش و مامەڵەو هەڵسوکەوتدا بەشێوەیەکی گشتی ببینرێن.

*حوکمە عەمەلیەکان لەقورئانی پیرۆزدا :

یەکـەم : پەرستـشەکان ( الاحکـــام العبـــادات ) : ئەوئایەتەپیرۆزانـــەن کـــەباس لەپەرستشەکانی وەك نویژو ڕۆژو زەکات و حەج و ئەوانی تر ئەوانی تر لەپەرستشەکان دەکەن ، کەهۆکارن بۆبەهێزکردنی پەیوەندی نێوان خوای گەورەو بەندەکان .

دووەم : خێزانیەکان ( الاحکـام الاسـرة ) : ئەوئایەتانـەن کـەباس لـەدیاری کردنـی ئەرکی سەرکەسەکان و ئەومافانەی کەلەسەریانە لەناو خێزاندا دەکات ، وەك یاساکانی هاوسەرگیری و تەلاقدان و منداڵ بەخێو کـردن و سەرپەرشـتی و پـەروەردەکردنیان و خەرجی دانیان .

سێیەم : مامەڵـە دارایـیەکان ( الاحکـام المعـاملات المالیـة ) : ئەوئایەتانـەن کـەباس لەخاوەندارێتی موڵکیەت دەکەن شێوازی مامەڵەو هەڵسوکەوت کردن لـەوبوارەدا ، وەك مافەتاکەکەسیەکان و بەستنی گرێ بەست و پابەندبوون پێوەی .

چوارەم : الاحکـام الدسـتوریة : ئـەویش ئەویاسـایانەدەگرێتەوە کـە بەشـێوەیەکی گشتی باس لەحوکمـەکان دەکـات ، چـونکە قورئـان پـەیامێکی گـشتیەو زۆر بـەووردی نەچوەتە ناو ووردەکاریەکان ، بەڵك و یاسای فرەڕەهەنـدو گـشتی دانـاوە ، تالێیانـەوە حوکمـــە فەرعیـــەکان جیابکرێتـــەوە ، بـــەڵام لەوحوکمـــە دەســـتوری و شـــەرعیانەدا چواربنەمای ڕەچاوکردووە :

بنـــەمای یەکـــەم : کـــارکردن بەسیـــستەمی ڕاوێـــژکاری ( شـــوری ) لەســـەرجەم بڕیارەکانداو دواتریش لـەجێ بـەجێ کردنیانـدا ، لەبـەر ڕۆشـنای ئایەتـە پیرۆزەکـانی ( وشاورهم فی الامر ) ال عمران – ١٥٩ و ( وأمرهم شوری بینهم ) الشوری – ٣٨ .

بنەمای دووەم : ڕەچاوکردنی عەدالەت لەسەرجەم حوکمـە قـەزای و ئیداریەکانـدا ، لەبەر ڕۆشنایی ئایەتی:

– إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنْ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ، النحل – ٩٠

- إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُمْ بَيْنَ النَّاسِ أَنْ تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ إِنَّ اللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُمْ بِهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا. النساء - ٥٨ ) .

بنەمای سێیەم : دابەشکردنی ئەرك ومـاف و ئیمتیـازات لەسـەربنەمای یەکسانی و داوای فەرمانێك لەکەسێك نـەکرێت کەلەتوانایـدا نـەبێت ، لەبـەر ڕۆشـنایی ئایـەتی: (لاَ يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلاَ وُسْعَهَا، البقرة - ٢٨٦ ) .

بنەمای چوارەم : پابەند بوونی ئومەت بەگشتی بەدەسەلاّتی ئیسلامی و گوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکانیان لەسنوری شەرعدا ، چونکە ( لا طاعة لمخلوق في معصية الخالق).

پێنجـەم : حوکمـە ئـابوری و ماڵیـەکان ( الاحكـام الاقتـصادية والماليـة العامـة ) : ئەوئایەتە پیرۆزانەن کەباس لە چالاکی یە ئابوریـەکان و ئـاڵوگۆڕ کردنـی پـارە دەکـەن ،لەسەر زەویدا ، وەك دیاری کردنی جۆری موڵك داریەتی و چۆنیەتی گەڕانەوەی بـۆلای خوای گەورە ، هەروەها ئەو ئایەتانەش کە بـاس لـە مـوڵکی گشتی و سـوودوەرگرتن لێی دەکەن ، وەك زەکات و باجی سەرزەویە فەتح کراوەکان .

شەشەم : الاحكام العلاقات الدولية : کەبریتین لە ئەحکامانـەی کـە هەڵدەهێنجرێن لەوئایەتە پیرۆزانەی قورئان کەپەیوەستن بەشـەڕو ئاشـتی ورێکـەوتن و پـەیمان نامـەو دانووسانەکان .

حەوتـەم : الاحكـام الجـرائم والعقوبـات : ئەوبڕیارانـەی لەسـەر تـاوان و لادان و خراپەکاریەکان دراون ، هەروەها دەربارەی سزاکانیش کەلەقورئانەوە وەردەگیرێـن ، تاوانەکانیش سێ جۆرن :

-جـرائم الحـدود : ئەوتاوانـەن کەهەڕەشـەن لەسـەر پەرژەوەندیـە پێویـستیەکانی ژیانی مرۆڤەکان، وەك زینا، دزی، ڕێگری، و چەتەیی و هتد..

-جرائم القصاص والدية : ئەوتاوانـەن کەهەڕەشـەن لەسـەرژیانی مـرۆڤ و سـەلامەت بوونی وەك کوشتن .

-جرائم التعزير : ئەوتاوانەن کەوەلی ئەمر یان دادوەر سزاکانیان بەگوێرەی تاوانەکە دیاری دەکات ، واتە ئەوکردەوەخراپانەی کە دەق ( نص ) یان لەسەرنی یە وەك بەرتیل خۆری ( رشوة ) وەی تریش ...

*دەلالەتی قورئان لەسەر ئەحکامە شەرعیەکان دووجۆرن :

یەکەم : الدلالة القطعية : بریتیەلەودەقەی کەماناکەی لەخودی دەقەکەخۆیدایە ، وەپێویستی بەئیجتهادو ( تعدیل ) نیە ، واتە ( قطعی ) یە ، کەبەمانی ( یقین ) نەگۆران دێت ، بۆیەئەگەرشتێك (قطعی) بوو ئەوەرێی مجادەلەی تێدانیە دەبێتەبەڵگەلەزاتی خۆیدا وەنەپێویستی بە (اقرار)ـە، وە نە بە (جعل)ـە، و نە بە ڕێگای تر، نموونەی ئەم بەڵگە بوونە لە شەرعدا:

١-خوای پەروەردگاردەفەرموێ: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ... المائدة /٦ ) لێرەدا (فَاغْسِلُوا) دەلالەتە لە سەر بەڵگەبوون لە سەر شۆردنی دەمووچاو( الوجه ) لەدەست نوێژدا بەشێوەی (قطعی) یە ، بۆیەزانایان ڕای جیایان نیە لەسەرحوکمی دەمووچاوشۆردن .

٢-خوای گەورەدەفەرموێت (وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُنَّ وَلَدٌ فَإِنْ كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ النساء / ١٢ ) دەلالەتی ( نصف ) لەم ئایەتەدا دەلالەتی (قطعی) يیە .

٣-خوای پەروەردگاردەفەرموێت (الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ وَلَا تَأْخُذْكُمْ بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ/ النور ٢ ) لەم ئایەتە پیرۆزەدا سزای ( زیناکەر ) ئەگەر بنەماو مەرجەکانی تیاداهاتنەدی ئەوا ( ١٠٠ )

جەڵد لەئەنجام دەرەکانی دەدرێت ، کەسیش بۆی نیە ئەم سزایە زیادبکات یان نەکەمی بکات ، یان گۆڕان کاری بەسەردابێنێ یان سوك یان قورس بکات .

دووەم : الدلالة الظنية : ئەوبەڵگەبوونە ودەلالەتەیە کەلەیەك مانا زیاترهەڵدەگرێ ، دەتوانرێت ئیجتهادو تەئویلاتی تیابکرێت ، بۆنوونە ( واذا ... الاعراف /٢٠٤ ) یان (لِلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِنْ نِسَائِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِنْ فَاءُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ(٢٢٦)وَإِنْ عَزَمُوا الطَّلَاقَ فَإِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ، البقرة /٢٢٦ –٢٢٧)، کە لێرەدا (المولی) ئەو کەسەیە کە چوونە ناو جێگاکەی خێزانی ئەنجام نەدات، بۆ ماوەی چوارمانگ کەدەلالەتی ئەدووئایەتەپیرۆزە لەسەرحوکمی ( المولی ) دەلالەتێکی ( ظنی ) یە ،زانیان ڕای جیایان هەیە لەسەرحوکمی ( المولی ) وسێ ڕایان هەیەلەسەری :

ڕای یەکەم : قسەی حەنەفیەکان و ئیباچیەکانە : کەدەڵێن :ژنەکەچوارمانگ چاوەڕێ بکات ،ئەگەر مێردەکەی لە ماوەی ئەو چوار مانگەدا گەڕایەوە، بۆ لای و لە گەڵی تێکەلأوی کردئەواباروددۆخەکەئاسای دەبێتەوە ، بەلأم ئەگەرمێردەکەی نەگەڕایەوەبۆلای لەدوای تێپەڕبوونی ئەوچوارمانگە ئەواتەلأقەکەی ڕاستەوخۆدەکەوێت بەبێ پێویست بوونی حوکمی دادگا .

ڕای دووەم : قسەی شافیعی و حەنبەلیەکانە کە دەڵێن : ژنەکەداوایەك بەرزدەکاتەوەو قازیش لەسەسەرینەمای ئەودەعوایە مێردەکەی ناچار دەکات کەبگەڕێتەوە بۆلای ژنەکەی بەلأم ئەگەرمێردەکەی ڕەتی کردەوە ئەوکاتەقازی جیایان ئەکاتەوە بەدەسەلأتی خۆی بەبێ حیساب کردن بۆپیاوەکەی .

ڕای سێیەم : کەزیاتر ڕای زەیدیەکان و ظاهیریەکانە: کە دەڵێن قازی زۆر لە مێردەکە دەکات ، کەتێکەلأوی ژن و مێردایەتی لەگەڵ خێزانەکەی دا بکات ، یان تەلأقی بدات، ئەگەرئەویش هیچکامیانی نەکرد ئەواحوکمی دەدات بەزیندان و لەوێ دەیهێڵێتەوە ، تاپەشیمان دەبێتەوە یان ژنەکەی تەلأق دەدات ، ئەگەرئینکاری کردلەزیندا ئەواتامردن لەزیندان دەیهێڵێتەوە .

نموونە لە سەر دەلالەتی ظنی: خوای گەورەدەفەرموێت (يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلَالَةِ إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ وَهُوَ يَرِثُهَا إِنْ لَمْ يَكُنْ لَهَا وَلَدٌ فَإِنْ

كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ وَإِنْ كَانُوا إِخْوَةً رِجَالاً وَنِسَاءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ يُبَيِّنُ اللّهُ لَكُمْ أَنْ تَضِلُّوا وَاللّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ، نساء / ١٧٦ ) ووشـەی ( و لا)، ڕای جیاجیای لەسـەرە واتـە دەلالـەتی زەنییـە لەبەرئـەوەزانایان ڕای جیاوازیـان هەیەلەسـەری ، ڕای جـەماوەری زانایـان لەسەرئەوەیە کەبەمانای ( کوڕ ) دیت ، کەواتە کچ خوشك مەنع ناکات لەبەشبردن لەمیراتـدا. یـان ئایـەتی (يُوصِيكُمْ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ فَإِنْ كُنَّ نِسَاءً فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ وَإِنْ كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ وَلأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِنْ كَانَ لَهُ وَلَدٌ فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلأُمِّهِ الثُّلُثُ فَإِنْ كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلأُمِّهِ السُّدُسُ مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا أَوْ دَيْنٍ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ لاَ تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعًا فَرِيضَةً مِنْ اللّهِ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًاالنساء /١١ ) لێرەدا ووشـەی (اخـوة) ڕایـی جیای لەسەر زانایان پێیان وایە کە ( اخوە ) لەدوزیاتر واتەبەرەو سەرەوەدەگرێتەوە لەخوشك وبرا ، هەرووەهابەڕای ( ابن عباس ) یش ( اخوة ) سیّ بەرەوسەرەوە دەگرێتەوە واتە سیّ زیاترو و

لەئایەتی (وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوءٍ وَلاَ يَحِلُّ لَهُنَّ أَنْ يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ اللّهُ فِي أَرْحَامِهِنَّ إِنْ كُنَّ يُؤْمِنَّ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ

فِي ذَلِكَ إِنْ أَرَادُوا إِصْلاَحًا وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ وَاللّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ،[٨])، ئەو ژنانەی پاش چوونە لایان، تەڵاق دران، تا سیّ پاکیی دەبـیّ، خۆیان بگرن، و مێرد نەکەنەوە،و بۆ ئـەو ژنـە تەڵاقدراوانـە، ڕەوا نییـە، ئـەوەی خـوا خستویەتییە منداڵدانیانەوە، بیشارنەوە،[٩] ......

مەبەستمان، لەفزی ( قروء)ـە، کە دەلالـەتی (ظنیـة)، کـە حەنـەفی، و هاوڕێکانیـان دەڵێن : ( قرء) واتە حەیز ، بەلاّم شافیعیەکان دەڵێن ( قرء)، واتە پاکبوونەوە (طهر).

---

٨ سورة البقرة / ٢٢٨

٩ تەفسیری ﴿ڕامان﴾، دانانی: مامۆستا ئەحمەد کاکە مەحموود،(نوّراللّه ضریحه).

## ﴿ الامر والنهي ﴾

الامرطلب الفعل من قد ارتقى بأفعل ، وللجوب ذاأن أطلقا
لايقتضى التكرار والفــور اِلا اذا عليهمـــــــا، دليل دلا
ولِلَامر موجب لـــمــــا توقفا هـــوعليه ، فاعلمن لتشرُفا
وليس بالنهى عـن الضد ولا مستلزماً لَهُ، كذا النهى اجعلا
و يدخل المؤمن فية، لا هـبِّى و مكره مــجـنـون ساهٍ فأدبِ
والكافرون خوطِبوا بـالفرع و شرطه ، فانقذ لحكم الشرع
و الامرللتهديد، والندب يرد كــــــذا أباحة، لغير ذا وُجِد
والنهى أن يطلب تركُ الفعل وفيه ما قد مَرَّ، يـــا ذا الفضل
لكنَّهُ للفوز، والـــــدم وام ولا اِشراط فـــيـــه، لِلاسلام

---

## ( باسی ئەمر )

ئەمر : ئەوداواكاریەیە كەلەلایەنێكی بالآوە بۆلایەنێكی ژێر دەستەدەردەچێت ،وەك : ( أقيموا الصلاة ) نوێژ بـەرپا بكـەن ، ( واتـوا الزكـاة ) زەكـات لـەمالتان دەربكـەن ) بۆیـەئامـاژەكردن ( اشـــارة ) هەرچــەندەمانایەكیش بەدەســتەوە بـدات ناچــێتەقالّبی ئەمرەوە ، هـەروەهاداواكاری كـردن بۆنـەكردنی كارێـك دیـسان لەچوارچـێوەی ئـەمردا جێـی نابێتــەوە ، چــونكەداواكاریەكەبۆكردنی كارێــك نیــە ، بەڵكوبۆنەكردنیــەتی ، لەكاتێكدائەمركردن بۆكردنی كارەكەیە ، وەهـەروەهادەبێت لەبالآوەبۆژێردەسـتەبێت ، بۆیەهاوشـانی یـەكتر ( الالتمـاس) و لـە خـوار بـۆ سـەرەوە ( الـدعاء ) لـەم قـالّبی ئەمرەدەچنەدەرەوە .

دەستەواژەكانی ئەمر :

<u>یەكەم</u> : فیعلی أمر : وەك ( <u>أتل</u> مآأوحي اليك من الكتاب ) .

دووەم : اسم فعلی أمر : وەك ( حی علی الصلاة ) .

سێیەم : المصدر نائب عن فعل الامر: وەك: (فاذا لقیتم الذین کفروا فضرب الرقاب).

چوارەم : فیعل موضاریعێك کە ( لام ) ئـەمری پێوەلکابێت ، وەك ( لتؤمنـوا بـالله ورسوله ) .

وەهـەروەها جارجـار دواکـاری کردنـی کارێـك لەغـەیری دەسـتەواژەی ئـەمریش دەفامرێتەوە ، وەك ئەوەی شتێك وەصف بکرێت ، بەوەی کە ( فـرض ) یـان (واجـب) یان (مندوب)ـە، یـان (طاعـة: پەرسـتش)ـە، یـاخود بکەرەکـەی بـە چـاکەکار نـاوزەد بکرێت، یاخودپاداشت دابنرێت بۆبکەرەکەی یاخودسزای ئەنجام نەدەرەکەی بدرێت .

## * دەستەواژەکانی ئەمر چی دەگەیەنن ؟

بەشـێوەیەکی گـشتی دەسـتەواژەی ئـەمر ، مانـای واجـب بـوونی ئـەمر پێکراوەکەدەگەیەنێت ، کەدەبێت لەزووترین کاتدا ئەنجام بدرێت ، بەبەڵگەی ئایەتی: (لَا تَجْعَلُوا دُعَاءَ الرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَاءِ بَعْضِكُمْ بَعْضًا قَدْ يَعْلَمُ اللَّهُ الَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنْكُمْ لِوَاذًا فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَنْ تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ(٦٣) سورة النـور، کەئـەم ئایەتـە لەورووەوە بەڵگەیەکە کەخوای پەروەردگار ئاگـاداری داوەتـە ئەوانـەی کـە سەرپێـچی فەرمانـەکانی پێغەمبـەر ﷺ دەکـەن ، کـەبۆی هەیەتووشـی فیتنـەی بێبـاوەڕو گومـان پەیداکردن ببن ، یاخودتووشی سزای تاڵ و سەخت بـبن ، کەئـەم ئاگادارکردنەوەیـەش لەسـەرئەوەیەکە واجبێـك تـەرك دەکـەن ، ئەمـەش بەڵگەیەکەفـەرمانی پێغەمبـەر ﷺ بەشێوەیەکی گشتی ئەمەدەگەیەنێت ، کەئەنجامدانی کارەفەرمان پێکراوەکـە واجبـە ، سەبارەت بەبەڵگەیش لەسەرئەوەی کە دەبێت ئەو فەرمانە دەبێت زوو ئەنجام بدرێت ،

ئەوئایەتەپیرۆزەیەکەدەفـەرموێت : ( فاسـتبقوا الخـیرات ) بێگومـان ئەوشـتانەش کەشەرع فەرمانی پێکردوون ، خێرن و چاکەن ، وەفەرمان کردنە بەوەی کەزوو ئەنجام بدرێن و پێش برکێیان بۆبکرێت ، بەڵگەیەلەسەرزووئەنجامدانیان ، هەروەها لەسـونەتی پێغەمبەریـشدا هـاتووە کەدواخـستنی فـەرمانی خـۆی بـەخراپ و نادروسـت زانیـوە ،

هەروەك لەڕۆژی حودەیبیەدا سەربڕین و سەرتاشینی فەرمان پێ کردن ، بەزووی و بەبێ دواخستن ، وەبێگومان زووئەنجامدانی کاری خێر زیاتر بەرەکەت و پێزدەداتەکارەکەوەو دواخستنیشی بێتام و گەنینی دەکات کاری خێرو چاکەش زۆردوابخرێت تابکەون بەسەرەکەیدا لەدەست دەردەچن و ئەنجام نادرێن .

جاری واهەیە ( أمر ) بەهۆی بەڵگەیەکەوە لەواجب بوون زوو ئەنجام دان لادەدات بۆمانای تر ، لەوانە :

١-الندب: سونەت : وەك ئەم فەرمایشتەی پەروەردگار کەدەفەرموێت: (و أشهدوا اذا تبايعتم)، کە فەرمانکردن لە شایەت گرتن لەکڕین و فرۆشتن سوننەتە ، بەبەڵگەی ئەوەی پێغەمبەرئەسپێکی لەکابرایەکی دەشتەکی کڕیوەو شایەتیشی نەگرتووە .

٢-درووست بوون کردنی ئەوکارە ( الأباحة ) بەتایبەتی ئەگەرلەدووای بێدارکردنەوە بێت، یاخودلەوەڵامی شتێکدا هاتبێت کەشێوەی بێدار کردنەوەی هەبێت ، وەك ئایەتی ( واذا حللتم فاصطادوا ) کەفەرمان بەڕاوکردن بۆئەوەیەکەدروستە بکرێت نەك هەردەبێت بکرێت ،چونکەئەم فەرمانەلەدووای ئەوبێدارکردنەوەی پێغەمبەلاهاتووە کە دەفەرموێت:

(غيرمحلي الصيد وانتم حرم ) . نموونەیش بۆدووەمیان ئەوەی کەوەڵام بێت بۆشتێك کەشێوەی وابێت ، بڕیاری قەدەغەی لەسەربێت ، ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەرە ( درودی خوای لێبێت ) کەدەفەرموێت ( أفعل ولاحرج ) بیکەوکێشەنیە ، کەئەمەش لەوەڵامی کەسێکدابووە ، کەلە ( الحجە الوداع : حەجیماڵئاوای ) یداپرسیاری لێکردووە سەبارەت بەپێشخستنی ئەوکارانەی حەج کەلەڕۆژی جەژنداپێش و پاشیان لەنێواندا بکرێت ،

٣-چاوترساندن ( تهديد ) : وەك ئایەتی: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي آيَاتِنَا لاَ يَخْفَوْنَ عَلَيْنَا أَفَمَنْ يُلْقَى فِي النَّارِ خَيْرٌ أَمْ مَنْ يَأْتِي آمِنًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ إِنَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ - ﴿ وَقُلْ الْحَقُّ مِنْ رَبِّكُمْ فَمَنْ شَاءَ فَلْيُؤْمِنْ وَمَنْ شَاءَ فَلْيَكْفُرْ إِنَّا أَعْتَدْنَا لِلظَّالِمِينَ

نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا وَإِنْ يَسْتَغِيثُوا يُغَاثُوا بِمَاءٍ كَالْمُهْلِ يَشْوِي الْوُجُوهَ بِئْسَ الشَّرَابُ وَسَاءَتْ مُرْتَفَقًا﴾، کە لە دووای کارەکە بەڵێنی ترسناکی داوەو چاوترساندنی تیا دەفامرێتەوە، کە ئەمەش بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە تەهدیدە.

جاری واهەیە کە (أمر ) لەزوو ئەنجامدانی دەگوزرێت بۆدواخستنی بۆکارێکی درەنگ وەك گرتنەوەی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان کەفەرمان پێکراوە ، بەلأم بەڵگەهەیەبۆئەوەی کە ( زوو ) کردنی پێویست نی یە بەڵکوبۆدواخستن و دواترگرتنەوەیەتی لەدایکە ( عایشة ) وە دەڵێت : ڕۆژووی ڕەمەزانم لەسەربوو نەم دەتوانی بیگرمەوە لەمانگی شەعباندا نەبێت ( کەدرەنگ ) بەهۆی جێگای پێغەمبەرەوە کەئەگەردواخستنی حەرام بوایە ئەوا وای نەدەکردوو دانی پیادا نەدەنا .

## (( مالايتم المأمور ألابه )) :

ئەوشتەی کەفەرمان پێکراوە کەبەبێ ئەو نەیەتەدی ! ئەگەرکردنی کارێکی فەرمان پێکراو وەستابوو لەسەرشتێکی تر ئەوانەوشتەی تریش دەبێتەکارێکی فەرمان پێکراو ئیترفەرمان پێکراوی یەکەم واجب بوو، ئەوا شتەیش واجب دەبێت ، مەندوب بوو، ئەویش مەندوب دەبێت، لەواجبدا وەك : داپۆشینی شەرمگا (عورة) ئەگەربەسترابووبەکرینی جلێکەوە ئەواکرینی ئەوجلەواجب دەکرێت ،وەلەمەندوبدا وەك خۆبۆن خۆش کردن بۆجومعە ، ئەگەربەسترابووبەکڕینی عەترێکەوە ئەوا کڕینی ئەوعەترەش مەندووب دەبێت ،بۆیەئەمەهەمووی لەچوارچێوەی یاسای ( الوسائل لها أحكام المقاصد ، فوسائل المأمورات مأموربها وسائل المنهيات منهى عنها ).

# ﴿ باســـــــی نـــــــــەهی ﴾

نــەهی : ئەوقــسەیەدەگرێتەوە کــەداواکاری دەستهێــشتنی کــارێکی تیاکرابێــت ، لەپلەیــەکی بــەرزەوە بۆپلەیــەکی خــوارەوە وەبەدەســتەواژەیەکی تایبــەت ، ئــەویش ئەوفعلــە مــوضــاریعەیــە کــە ( لا ) ی ناهیــەی چــوبێتە ســەر وەك ئــەم فەرمایــشتەی پەروەردگارکەدەفــەرموێت: (ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِنْ الأَمْـرِ فَاتَّبِعْهَـا وَلاَ تَتَّبِـعْ أَهْـوَاءَ الَّــذِينَ لاَ يَعْلَمُــونَ)، بۆیــە لێــرەدا ئــەوە بزانــە کــە ئامــاژە کــردن بــۆ نــەهی ناچــێتە چوارچێوەی ئەم پێناسەیەوە وەدەبێت داوابکرێت بە ( نەکردن ) لەپلــەی ســەرەوە بۆخـــوارەوە بۆیـــە ئـــەمیش ( الالتمـــاس ) و (الـــدعاء) لـــێ دەچـــنە دەرەوە ،وەهەروەهابۆیەدەستەواژەی (صیغة)کەی

دیاری کرد، بە فیعلی موضاریعی کە ( لا ) ناهیەی چووبێتە سەر تاصیغەکانی تـری وەك : (دع : وازبێنــە ) ( أتــرك : تــەرکی بکــە ) ئەمانــە نەگرێتــەوە ، چــونکەئەمانە دەچنەچوارچــێوەی نــەهی ، نــەك ئــەمر وەهەروەهاجارجارصــیغەی نــەهی لەشــێوازی تــریش وەردەگیرێــت وەك ئــەوەی کارێــك بەحــەرام یــان خــراپ یــان ســزادار ، یــان سەرزەنشتکردنی بکەرەکەی وەصف بکرێت ،

– ئەوەی لە دەستەواژەی نەهی دەفامرێتەوە:

دەســتەواژەی نــەهی بەشــێوەیەکی گشتی مانــای حــەرام بــون و خراپــی شــتەنەهی کراوەکـــەدەردەخات ، لەوبەڵگانـــەی کەنیـــشانەی حـــەرامی شـــتەکەدەردەخەن ئەوەیەکەپەروەردگاردەفەرموێت: (وَمَا آتَاكُمْ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَـا نَهَـاكُمْ عَنْـهُ فَـانْتَهُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ)، کە لێرەدا فەرمانکردن بە ( اِنتهاء: کۆتایی پێهێنان)، لە شتە نەهی لێکراوەکان نیشانەی واجب بــوونی ئــەو کۆتــایی پێهێنانــەن، وە ئەمــەش

نیشانەی حەرامیی کارەکەیە، وە بەڵگەش لە سەر ئەوەی کە نەهیلێکراو کاری خراپە دەگەیەنێت، ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت : ( من عمل عملا ليش عليه أمرنا فهو رد )،(رواه مسلم)، واتە: ئەوەی کارێك ئەنجام بدات ئێمەپێی ڕازی نەبین و نەمان کردبێت ئەوکارە ڕەتکراوەیە ، بۆیەئەوەی نەهی لێکراوە، ڕەتکراوەیە، و خراپە، چونکە لە سەر ڕەوڕەوەی پێغەمبەر ﷺنی یە، سەبارەت بەنەهی لێکراو کەئایابەتاڵە یان دروستە ، سەرەڕای حەرامیەتیەکەی بەم شێوەیەیە :

١-دەبێت نەهی یەکەبگەڕێتەوە بۆخودی شتەنەهی لێکراوەکە یان بۆ( مەرجەکە ) ی ئیترلێرەوەبەتاڵ دەبێتەوە ، نموونەبۆئەوەی کەبۆخودی شتەنەهی لێکراوەکەبگەڕێتەوە ، لەخواپەرستیدا وەك نەهی کردن لەڕۆژوو گرتن لەدوو جەژنەکەدا ، ونموونە بۆخودی شتەنەهی لێ کراوەکە لەمامەڵەدا وەك : نەهی کردن لەکرین و فرۆشتن دوای بانگی دووەمی جومعە لەسەرئەوانە جومعەیان بۆواجبە ، نموونە بۆئەوەی کەنەهی کردنەکەبۆمەرجەکە (شرط) بگەڕێتەوە ، لەخواپەرستیدا وەك نەهی کردن لەلەبەرکردنی جلکی حەریر بۆپیاوان وەداپۆشینی شەرمگا (عەورەت)، مەرجی دروست بوونی نوێژە، بۆیەداپۆشینی بەجلکی حەرام لێکراو نوێژەکەی دروست نابێت، چونکەلێرەدا نەهی یەکە بۆمەرجەکەدەگەڕێتەوە . نموونە بۆئەوەی کەنەهی کردنەکە بۆمەرجەکە بگەڕێتەوە بەڵام لەمەعامەلاتدا وەك نەهی کردن لەفرۆشتنی بەچکەی ناوسك چونکە زانیاری بوون بەفرۆشراو یەکێکە لەمەرجەکانی دروستی ئەوکرین و فرۆشتنە بۆیە ( بەچکەی سك ) فرۆشرا ، ئەومامەڵەدرووست نیە، لێرەدانەهی یەکە بۆمەرجەکەدەگەڕێتەوە .

٢-ئەوەیەکە نەهی یەکە بگەڕێتەوە بۆشتێکی دەرەکی نەبەسترابێت بەخودی نەهی لێکراوەکەو هەروەها نەش بەسترابێت ، بە ( مەرج ) ەکانی یەوە ، بۆیەئەمەیان بەبەتاڵ دانانرێت ، نموونەی نەهی کەبۆکارێکی دەرەکی بگەڕێتەوە لەخواپەرستیدا وەك نەهی کردن لەوەی کەپیاو میزەرەو مشکی حەریر بدات بەسەریدا ، بۆیەکەنوێژی

کردو حەریری بەسەرەوە بوو نوێژەکەی بەتاڵ نی یە ، چونکەنەهی یەکە بۆخودی نوێژەکەو شەرتەکانی ناگەڕێتەوە . نموونەی ئەوەی کەبۆشتێکی دەرەکی بگەڕێتەوە، لەموعامەلاتدا وەك نەهی کردن لەغەش بۆیەئەگەرکەسێك شتێکی بەغەشکاری فرۆشت ،ئەوابەیعەکەی بەتاڵ نی یە ، چونکە لێرەشتەنەهی یەکە نەبۆخودی مامەڵەکەو نەبۆشەرتەکانی ناگەڕێتەوە .جاروبار نەهی بۆمانای تری جگەلە ( تحريم ) بەبوونی بەڵگەیەك دەگوڕدرێت ، لەوانە :

١-ناپەسەندنی ( الكراهــة ) : کەئـەمیش ئەوفەرمودەیەکراوەبەبلگە بۆی کە دەفەرموێت : ( لايمسن أحدكم ذكره بيمينه وهويبول ) ( متفق عليه ) واتە: با کەسێکتان کە میز دەکات، بە دەستی ڕاستی شەرمگای نەگرێت، لێرەدا جەماوەری زانایان دەڵێن ئەم نەهی کردنە بۆناپەسەندبوون و ( الكراهيه ) ، چونکە شەرمگا بەشێکەلەجەستەی مرۆڤ مەبەست لەونەهی کردنە پاراستنی پاك و خاوێنی لای ڕاستە.

٢-بەرچاوڕوونی ( الارشاد ) : وەك ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر بۆمەعازی کوڕی جەبەل کەپێی فەرموی : ( لاتدعن أن تقول دبر كل صلاة اللهم أعني على ذكرك وشكرك وحسن عبادتك ) واتە: ئەی مەعاز قەت لەدوای نوێژەکانت ئەم زیکرەتەرك مەکەو بڵێ : خودایەکۆمەکیم بکەو یارمەتیم بدە لەسەریادکردنت و سوپاس کردنت و چاك پەرستنت .

ئەوانەی ئەمرونەهی ئەیانگرێتەوە :دەبێت ئەوکەسەگەورە ( بالغ ) بێت بۆیەبچوك ئەمرو نەهی نایگرێتەوە ، پاشان ژیر ( عاقل ) بێت ، بۆیەشێت ناچێتە ئەم قاڵبەوە . بەلام لەمنداڵدا فەرمانی بەنوێژو ڕۆژو پەرستش بەگوێرەی توانا پێ دەکرێت ، تافێربێت ، وەشتیش لەهەندێ کاری خراپ کەزیادمەنبێت بۆخەڵکی بەرگری لێ دەکرێت ، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەرمنداڵ

وشێت مولکیان هەبوو زەکاتی لێ دەردەکرێت ، چونکە زەکات پەیوەست نی یە بەخۆیانەوە بەڵکوپەیوەستەبەماڵەکەیانەوە کەگەیشتەئاستی خۆی زەکاتی لێ

دەردەکرێت ، بڕیاری ئەمرونەهی موسڵمانان و کافران دەگرێتەوە بەلاّم کافرتاکافربێت کارەباشەکەی لێ وەرناگیرێت بەبەڵگەی فەرمایشتی پەرەوەردگار: (وَمَا مَنَعَهُمْ أَنْ تُقْبَلَ مِنْهُمْ نَفَقَاتُهُمْ إِلاَّ أَنَّهُمْ كَفَرُوا بِاللَّهِ وَبِرَسُولِهِ وَلاَ يَأْتُونَ الصَّلاَةَ إِلاَّ وَهُمْ كُسَالَى وَلاَ يُنفِقُونَ إِلاَّ وَهُمْ كَارِهُونَ) کە موسڵمانیش بوو، لە سەری نییە، قەزای بکاتەوە ، بە بەڵگەی: (قُلْ لِلَّذِينَ كَفَرُوا إِنْ يَنتَهُوا يُغْفَرْ لَهُمْ مَا قَدْ سَلَفَ وَإِنْ يَعُودُوا فَقَدْ مَضَتْ سُنَّةُ الأَوَّلِينَ) وە فەرموودەی پێغەمبەرﷺکەبەعەمری کوڕی عاسی فەرموو : ( أماعلمت ياعمرو أن الاسلام يهدم ماكان قبلە . رواه مسلم ) ئەی عەمر نەتزانیوە کەئیسلامەتی ئەوەی پێش خۆی دەهاڕێت و دەی سڕێتەوە ؟! بەلاّم کەبەکافری مرد لەسەرئەوناگوێڕایەڵبوونەی سزادەدرێت ، بەبەڵگەی ئەوفەرمایشتەی خوای پەروەردگار کەلەوەلاّمی تاوانبارانداکەپرسیار دەکەن دەفەرموێت: (مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ(٤٢)قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ(٤٣)وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ الْمِسْكِينَ(٤٤)وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ الْخَائِضِينَ(٤٥)وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ الدِّينِ(٤٦)حَتَّى أَتَانَا الْيَقِينُ(٤٧) ﴿سورة المدثر﴾.

*ئەوشتانە کەدەبنەڕێگر کەمرۆڤ نەکەوێتە ژێرباری بڕیارەکانی شەریعەت لەوانە : ( نەزانی الجهل ) ( لەبیرچوونەوە ، النسيان ) تۆبزی کردن ، الاكراه ) بەبەڵگەی فەرمایشتی پێغەمبەرﷺ کە دەفەرموێت: (أنَّ الله تجاوز عن أمتي الخطأ، و النسيان، و مااستكرهوا عليه)، خودای گەورە لەنەزانی و لەبیرچوونەوەو تۆبزی ئوممەتەکەم خۆشبووە، رواه ابن ماجة، بۆیە بە نەزانی

(الجهل)، هەر کەسێك کارێکی حەرامی کرد، لە سەری ناکەوێت، وەك ئەوەی کەسێك لەنوێژداقسەبکات ، وەنەزانێت کەقسەکردن لەنوێژداحرامە ، یان واجبێك تەرك بکات و نەزانێ کەئەو کارە واجبە ، ئەمە قەزاکردنەوەی لەسەرنی یە ئەگەرکاتەکەی بەسەر ڕۆشتبوو بەبەڵگەی ئەوەی کەپێغەمبەر فەرمانی بەکەسێك نەکردووە کەهەڵەی خراپی لەنوێژەکەیدا کردبێت ، کەقەزای بکاتەوە ، ئەوانەی کەلەدەستی چوون بەڵکوفەرمانی پێکردووە لەمەودوا شەرعیانە نوێژەکانی بکات ، دەربارەی لەبیرچوونەوە ئەگەرکەسێك بەلەبیرچوون کارێکی

ناشەرعی کرد هیچی لەسەرنی یە بۆنموونە لەرەمەزاندا شتی خوارد یان لەبیری چوو واجبێکی جێبەجێ نەکرد ئەوە هیچی لەسەرنی یە ، بەلاَم دەبێت بیری کەوتەوە کارەکە بکاتەوە بەبەڵگەی ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر کەدەفەرموێت ( من نسی صلاة فليصلها أذا ذكرها، متفق عليه)، ئەگەر کەسێك بیری چوو نوێژەکەی بکات باکاتێك کەبیری کەوتەوەبیکات . دەربارەی تۆبزی وزۆرلێکردن ئەگەرکەسێك بەزۆر کارێکی حەرامی پێکرا ئەوەهیچی لەسەرنی یە ، وەك ئەوەی کەسێك بەزۆر کفری پێبکرێت و دڵی پربێت لەباوەڕ یان بەزۆر نەهێلرێت یەکێك لەواجباتە شەرعیەکان جێ بەجێ بکات بۆیە بۆئەمەیان دەبێ دواتر کەرزگاری بوو قەزای بکاتەوە ، وەك ئەوەی بەزۆرنەهێلرێت نوێژێك بەرپابکات و دواترکاتی نوێژەکەی بروات بۆیە دەبێت کەرزگاری بوو قەزای نوێژەکەی بکاتەوە . ئەوەی کەباسکرا لەو رێگرانە سەبارەت بەمافەکانی خوای پەروەردگارە لەسەر رحم و بەزەی و لێخۆشبوونی ئەو زاتە وەستاوە ، بەلاَم سەبارەت بەمافی خەڵکی ئەوەتاخاوەنەکەی ئاگادارنەکرێت یان دواتر حەقی بۆنەکرێتەوە ئەو مافەلەسەرنەنجام دەرەکە لاناچێت ، وەدەبێ بەگوێرەی تواناو بۆگونجان چارەسەری دۆخەکەبکات ( والله اعلم ) .

﴿الخبر و الانشاء﴾

محتمل الصـــدق، و ضــدُّه الخبر و غيره الانشاء، فاحـــــــذر البطر

---

## ﴿باسی خەبەر، و ئینشاء﴾

لە لایەکی ترەوە، کەلام لە ڕووی ڕاستی، و ناڕاستییەوە دەبێت، بە دوو بەشەوە:

١- خەبەر: ئەوەیەکەلەخودی خۆیدا دەکرێت وەصف بکرێت بەوەی کەدرۆیە یان ڕاستە ، بۆیەئەوخەبەرەی کەدرۆو ڕاستی بوونی لەغەیری زاتی خۆیدا دیاری دەکرێت ، لەم چوارچێوەیەدا جێی نابێتەوە ، بۆیەخەبەرلەڕووی خەبەردراوەکەوە دەبێت بەسێ بەشەوە :

یەکەم : ئەوەی قەت نکرێت بەدرۆ وەصف بکرێت وەك ئەوشتانەی کە بەدرووستی لەلایەن خوای پەروەردگارو پێغەمبەرەوە خەبەریان لەسەردراوە

دووەم : ئەوەی کەناکرێت بەڕاست وەصف بکرێت ، وەك خەبەردان بەبوونی شتێکی نەگونجاو ئیترلەشەرع دابێت وەك کەسێك لەدوای پێغەمبەر بانگەشەی پێغەمبەرایەتی بکات یان لەعەقڵدا بێت ، وەك بانگەشەکردن بۆدرووستکردنی بازنەی چوارگۆشە لەیەك کاتدا کەقەت نابێت .

سێیەم : ئەوەی کەدەکرێت بەڕاست ودرۆ ( بەیەکسان بوونی هەردوو حاڵەتەکە یان زاڵبوونی حاڵەتێکیان بەسەرحاڵەتێکی تریاندا ) پێناسەبکرێت ، وەك خەبەردانی کەسێك بەوەی کەکەسێکی تر لەوێ نەبووە ، بڕی داوە یان نا .... !

٢-ئینشاء : ڕستەیەکە گونجانی ڕاست یان درۆی بۆنی یە ، یان دەڵێن ئینشا ئەوەیە کەناوەڕۆکەکەی نەحقوقی نەبێت ، وەبەدی نەیەت مەگەر ئەو کاتەی کەلەلایەن بوێژەوە دەبێژرێ لەوکاتەدا مومکینە،

ولەچورچێوەی ئینشادا بەئەمرو نەهی هاتووە ، واتە ئینشای تەڵەبی ، نموونەی ئەمرونەهی وەك ئایەتی ( واعبدلله ولاتشركوا بەشیئا ) یان ئەمر لە شیعردا وەك :

ألا أيها الليل الطويل ألا انجلى بصبح، و ما الاصباح، منك بأمثل

یان لە ( نهی ) دا وەك :

لا تتركني فيهم شطيرا أني أذن أهلك أوأطيرا

ئەوەش بزانە کەجاری واهەیە کەلام بەشێوەی خەبەردێت وەمەبەست لێی ئینشایە ، وەك ئەم فەرمایشتەی پەروەردگاکەدەفەرموێت : (وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوءٍ.........)، کە فەرمایشتی (یتربصن) بەشێوەی خەبەرهاتووە ، کەچی مەبەست پێی ئەمرە ، کەئامانج تیایدا جەختکردنەوەیە لەسەرشتەفەرمان پێکراوەکە ، تاوەك ئەمرێکی حەتمی دەری بخات ، یان جاری واهەیەرستەکەئینشائیە ، کەچی مەبەست تیایدا خەبەرە وەك ئایەتی (وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلَّذِينَ آمَنُوا اتَّبِعُوا سَبِيلَنَا وَلْنَحْمِلْ خَطَايَاكُمْ وَمَا هُمْ بِحَامِلِينَ مِنْ خَطَايَاهُمْ مِنْ شَيْءٍ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ)، کە فەرمایشتی (ولنحمل ) لەسەرشێوەی ئەمرە کەچی مەبەست تیایداخەبەردانە ، واتە ( ونحن نحمل : ئێمە هەڵی دەگرین)، و سوودی ئەمەش لەوەدایە کە شتە خەبەر لێدراوەکە بباتە ئاستی شتێکی فەرز، و پێویست، کە دەبێت پێوەی پابەند بن.

﴿الحقيقة والمجاز﴾

وكل ما بقي على ما قد وضع ‏ ‏ لـــــه حقيقة كأسد، للسبح

وغيره المجاز، ذو أنـــــواع ‏ ‏ كأسد للرجل الشـــجـــاع

---

## ﴿ باسی حەقیقەت، و مەجاز ﴾

دیسانەوە کەلام لەڕووی بەکارهێنانەوە دووبەشی تری لێدەبێتەوە کەئەوانیش حەقیقەت، و مەجازن:

یەکەم : حەقیقەت :ئەوبێژەیەکە ڕاستەوخۆبەکاردەهێنرێت ، بۆئەوشتەی کەبۆی وتراوەو دانراوە ، وەك ( أسد : شێر ) کەناوەبۆئاژەڵێکی دڕندە ، بۆیەشتی بێ مانا لەچوارچێوەی حەقیقەت و مەجازدا جێی نابێتەوە ، حەقیەتیش دەبێ بەسێ بەشەوە : ( زمانەوانی : لغوی ) ، ( شەرعی : شرعیة ) ، ( باو : عرفیة ) .

حەقیقەتی زمانەوانی : ئەولەفزەیەکەلەزماندا بۆمانایەکی دیاری کراو دانرابێت ، وەك ( الصلاه : نوێژ)

کەلەحەقیقەتی زمانەوانی دا بەمانای ( دوعا ) هاتووە .

حەقیقەتی شەرعی : ئەولەفزەیەکەلەشەرعدا بۆمانایەکی تایبەت دانرابێت ، وەك دیسان ( الصلاة ) کەبۆهەڵسوکەوتێکی تایبەتی دانراوە ، کە ( نوێژە ) وبە ( الله أكبر ) دەست پێ دەکات ، وەبەسەلامدانەوە کۆتای دێت .

حەقیقەتی عورفی : ئەوەیەکەلە باو ( عرف ) دا بۆواتایەکی تایبەت دانرابێت ،وەك : ووشەی ( الدابة : ئاژەڵ ) ، کەبۆشتێکی چوارپێ دانراوەو لەعورفدا بۆی بەکاردەهێنرێت .ئەم دابەشکردنەی حەقیقی سێ جۆرسودی تایبەتی خۆی هەیە ، هەموولەفزێك دەتوانێت بەگوێرەی بەکارهێنانی بۆ (زمانەوانی) و ( شەرعی ) و ( عورفی ) دابەش بکەین و مانای حەقیقی خۆی پێ بدەین .

<u>**دووەم**</u> : مـــەجازی : ئەولەفزەیەکەبـــەکاردەهێنرێت بۆغـــەیری ئەوشـــتەی کەلەئەصـڵدابۆی دانـراوە ، وەك ووشـەی ( أسـد ) کەسـێکی ئازابـەکاربهێنرێت ، لـەم پێناسەیەوە ( مهمل ) و ( حقیقی ) دەچنەدەرەوە ، هیچ لەفزێکیش نـاتوانین بگۆڕین بۆمەجاز ،مەگەربەڵگەونیشانەهەبێت لەسەری ، ودەبێت بـەکارهێنانی لـەفز بۆمـەجازی پەیوەندی لـەنێوان ئەومەجازیـەو حەقیقەتەکـەدا هـەبێت ، ئینجادروستەماناکەی تـری وەربگیرێت ، لەزانستی ڕەوانبێژیدا بە ( علاقە : پەیوەندی ) ناوبراوە ،ئەوپەیوەندیەش یان لەڕووی ( لێکـچوون ، کەبـە ( استعارە ) ناودەبرێـت ، وەك بـەکارهێنانی لـەفزی ( شجاع ) بۆکەسێکی ئازا ، بەلاّم ئەوپەیوەندی یە غەیری لێکـچوو بـوو، ئەوابـە ( المجـاز المرسل ) و ( المجاز العقلی ) ناودەبرێـت ،لەمـەجازی مورسـەلداوەك : ( رعینـا المطـر ) کەووشـەی ( المطـر : بـاران ) بەمەجازبـەکارهاتووە ، لـەجیاتی ( العـشب : گـژوگیا ) و مەجازی عەقلّی ،وەك ( أنبت المطر العشب ) ، کەلەم ووشانەدا سـەرجەمییان مەبەسـت پێیـان حەقیقەتـە بـەلاّم دانـە پـاڵی (انبـات: ژیاندنـەوە) بـۆ لالـە بـاران ، واتـە .بـاران گوژوگیا بوژاندنەوە مەجاز ییە، چوونکە بوژاندنەرەوەی ڕاستەقینەو حـەقیقی بەسـزای خوای پەروە ر دگارە هەروەها لە مەجازی مورسەلەدا،( مەجازکردن بە زیـادە ڕەوە) و (مەجازکردن بە حـەزف ) هەیـە وەك : (لـیس کمثلـه شـئ ) کەمـە جـازە بـە حـەرف زیادە، کە (کاف) زیادەیە، وبـۆ جـەخت کردنەوەیـە لـە سـەرئەوەی کـە خـوای پـەروە ردگار هاوشێوەی نییە ؟ وەنموونە مەجاز بەحەرف وەك فەرمایـشتی پـەروەردگار کـە دەفەرموێت: (وأسال القرية)، کە خۆی (واسئل أهل القرية)

بووە، کە ( قرية ) حەزفکراوە بەمەجازی و ، ئەوەش بزانەکە مەجاز بەشـی زۆرتـری هەیەو لەزانستی بەلاغەدا باسکراوە ، وەبۆ ( أصول الفقه ) ئەمەندە بەسە .

<u>***ڕوونکردنەوە:***</u> لێرەدا دەچینە سەرباسـی ڕوونکردنـەوە و ڕاڤـەی هەرچـوار زاراوەی (قَسَمَ : سوێند خواردن ) ،(استفهام ، پرسیار کردن ) ، (عرض : دەرخـستن و خـستنە بەرچاو ) ، ( تمنی : هیواخواستن ) وبەکورتی هەریەکەیان شی دەکەینەوە:

سوێندخواردن : ( قسم ) : شێوازەلەشێوازەکانی ئینشای ناطەلەبی ، واتە: لە کاتی خواستن و ویستندا نی یە ، وەلەچەندشـێوەیەکدا خـۆی دەردەخـات ، وەك ئـەم دێـڕە هۆنراوەیەی ( *میصباح* ) ی شاعیر کەدەڵێت :

قامەت نی یە ، بیللا قیامەت بوو، هەڵسا

لەو شۆڕش، و غەوغایە، کە پەیدایە لە باڵآت!

پرسـیاری ( اسـتفهام ) : ئـەم جۆرێکەلەئینـشای تەڵـەبی ، کـەداوای شـتێکی پـێ دەکرێت ، کەبەبڕیار بێژەرەکەلەکاتی ویستن دا نەبووبێت ، وەك ئەم دێڕەشیعرانە :

هل تعرفون لباناتي فأرجوان تقضى فيرتد بعض الروح للجسد

یان مامۆستا ﴿قانیع﴾ دەڵێت:

کەی کوفرەگەر فێری ببی سەنعەت وحیکمەت

کەی مەنعە لە تۆ، بە ئاثار،و بە ئایەت

*عـرض* : ئەوەیەکـە بوێژەکـە مەبەسـتی دەروونـی خـۆی بەسـەوق و ئاژوانـد ن و دەوروبـەرو قـەراین رسـتەدەربخات نـەك بەشـێوەی حەقیقـەت ،یـان مـەجازو کینایـە بۆنموونـە کەسـێك بڵێـت ، مـن قـسەی خـەراپ ناکـەم ، تاخـەڵکی نـاخۆشمی بوێـت ) کەدەیەوێت کەسێکی دیاری کراو حاڵی بکات ، کەخەڵکی ناخۆشیان دەوێـت ، چـونکە قسەی خراپ دەکات ، وەئەومانایەش لەئاژواندنی ووتارەکەبەدەست دێت ، یـان وەك ئەم دێڕە شیعرە کە دەڵێت:

بـــــــەکەسێ بڵێ، زاناوو زیـــــــــــرەك

حوبب، و بـــوغزی کـــەس لای نەدا، لە حەق

(هیوا خواستن : التمنی): ئەمیش خواستنی هیوایە بۆ شتێك كە جارێ لە دەستڕەسدا نەبێت، وەك ئەم دوو دێڕە شیعرە:

فیالیت الشباب یعود یوما
فأخبره، بما فعل المشیب
وەشڵەی گەنجییەكەیم گێڵێوە دماوە
شكات و پیریم كەردێ جەلاوە[10]

[10] گەشتێ لە عیلمی بەلاغە. محمدسعید ابراهیمی محمدی، ئازەربایجانی غەربی، مهاباد، چاپی یەكەم، ١٩٨٥ .

﴿ العام ﴾

والعام مـــا يشمل فوق واحد ولفظه ذو اللام، نحو الحاسد
فرداًوجمعاً مبهم ، اسم عمَّ لا في النكرات كُــل ذا قد نُقِلا
عُم العموم مـن صفات النطق و ليس في فعل فكُنْ ذا حِذق
ونـحـو ، لا أكلتُ إنْ أكلتُ تحميمُهُ أصَحُ، مــــــا رأ يتُ

## ﴿ باسی عام ﴾

عام : بە مانای گشتی و گشتگیر دێت ،کە بـە شـێوازێك دەربـبڕدرێـت کەسـەرجەم پێکهات و لایە نەکانی ئەو دەربڕاوە بگرێتەوە بەپێی جیاوازی و چەند و چوون ، وەك خوای پەروەردگار دەفەرمێت : (أنَ الأبرار لفی نعیم ) کە(الأبرار) رێگری چاکە کـاران بەبێ جیاوازی و چەند و چوون و کەم و زۆر و سنوردارکردن (حصر) دەگرێتەوە ، ئەم لە فزی (عموم ) رەش جاری واهەیە ڕا ستەو خۆ (بالـذات) وجـاری وا هەیـە بـە بـەرکار (واسطة ) عمومی ئەو شتەی بۆی دەگوڕێت ، ودەیگرێتەوە .

ـ شێوازەکانی دەربڕینی عام :

١–ئەوەی خۆی لەخۆیدا مانای (عام : گشتی ) دەگەیەنێت ، وەك لـەفزەکانی ( کل ، جمیع ، کافة، قاطبة، عامة)، وەك ئایەتی (إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ) .

٢–ئیسمی شەرتەکان، وەك ئایەتی (مَنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِنَفْسِهِ– فَأَيْنَمَا تُوَلُّوا فَثَمَّ وَجْهُ اللَّهِ ).

٣–ئیسمی ئیستفهام، وەك ئەم فەرمایشتەی خوای پـەروەردگار کـە دەفـەرموێت: ( فمن یأتیکم بماء معین – ماذا اجبتم المرسلین – فأین تذهبون).

٤-ئیسمە مەوصولەکان، وەك ئایەتەکانی: ( والـذین جاءو بالصدق وصدقوا بـه أولئك هم المتقون - والذین جاهدوا فینا لنهدینهم سبلنا - ان في ذلك لعبرة لمن یغشی - ولله مافي السموات وما في الارض ) .

٥-نەناسراو ( النكرة ) لەدەستەواژەی نەفی یان نەهی یان شەرت یان ئیستفهامی یا ئینكاریدا ، وەك ئەم ئایەتە پیرۆزە ( وما من ألة إلا الله - واعبدوا للة ولاتشركوا بة شیئا - ان تبدوا شیئا أوتخفوة فأن الله كان بكل شيئ علیما - من ألة غیراللة یأتیكم بضیاء ) .

٦-( المعرف با لاضافة ) ئیتر موفرەد دێت یان جمع چوون یەکە وەك ئەم ئایەتە پیرۆزانە ( واذكروا نعمة الله علیكم - فأذكروا الاء الله ) .

٧-المعرف بأل الاستغراقیة ، ئیتر ئەمیش موفرەدبێت یان جەمع چوونیەکە وەك ئەم ئایەتەپیرۆزانە ( وخلق الانسان ضعیفا - واذا بلغ اطفال منكم الحلم فلشیئا ذنوا كما أستأذن الذین من قبلهم )، بەلاّم سەبارەت بە ئەلف و لامی عەهدی ئەمە بە گوێرەی پەیمان لەسەردراوەکە یە، ئەگەر عام بوو، ئەوا مەعریفەکەیش عامە، ئەگەر خاص بوو ، ئەوا مەعریفەکەش خاصە ، نموونە بۆعام وەك ئایەتی: ﴿إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَرًا مِنْ طِينٍ(٧١)فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ(٧٢) فَسَجَدَ الْمَلَائِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ(٧٣)إِلاَّ إِبْلِيسَ اسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنْ الْكَافِرِينَ(٧٤)ص﴾ نموونەی خاص وەك ئایەتی ( كما أرسلنا الی فرعون رسولا ، فعصی فرعون رسولا) بەلاّم موعەرەف بەئەلف ولامی بەیانی جنس ئەوەسەرجەم تاکەکان نگرێتەوە بۆیە کەووتت ( الرجل خیر من المرءة : پیاو لە ژن باشترە)،

ئەوەمەبەست ئەوەنی یە کە هەمووتاکێکی پیاو لەهەمووتاکێکی ژن باشترە ، بەڵکومەبەست ئەوەیەکە جنسی پیاو لەجنسی ژن باشترە ، هەرچەندەژنی واهەیە لەپیاو باشترە .

## ﴿ کارکردن بە عام ﴾

کارکردن بەلەفزی عام بەگشتی واجبێکی شەرعی یە ، تابەڵگەیەك پەیدادەبێت و وەتەخصیصی دەکات ، چونکە کارکردن بەدەقەکانی قورئان و سونەت واجبە ، بەوشێوازەی کەهەن و خوازیارن و لەسەرئەو حاڵەتی کەتیایدان ، تابەڵگەیەکی ساغ و درووست پەیدادەبێت و حاڵەتەکەیان دەگۆڕێت ، وەهەرکاتێکیش عام هات بەسەرحاڵەتێکی تایبەتدا ، ئەواکارکردن بەعامەکە واجبە ، نەك بەسەبەبەکە ، ( العبرة بعموم اللفظ لا بخصوص السبب)، تا بەڵگەیەك پەیدادەبێت و لەڕاڕەوی خۆی لای دەدات ئەو عامە وەك سەبەبەکە تەخصیص دەکات ، ئەو کاتە دروستە وای پێ بکرێت، نموونەش بۆئەوەی کەبەڵگەمان نی یە بۆتەخصیص کردن ، ئایەتەکانی ( ظهار )ە ، کە هۆکاری نازڵ بوونەکەیان (ظهار) کردنی ئەوسێ کوڕەی صامت بوو کەحوکمەکەش لەوەو دواو لەهی تریشدا هەربەعامی دەمێنێتەوە .نموونەیش بۆئەوەی کەبەڵگەمان هەیە لەسەرتخصیص کردنی ئەوبەڵگەیەی پێغەمبەر کەدەفەرموێت ( لیس من البر الصیام فی السفر – متفق علیه )، کەهۆکارەکەی ئەوەیە کە پێغەمبەرﷺ لە سەفەردا بوو، قەرەباڵغیەکی دی و بینی پیاوێك سێبەری بۆکراوە و نەخۆشە ، فەرموی ئەوەچی یە ؟ فەرموویان ئەوەبەڕۆژووە ، ئیتر ئەویش فەرمووی لەسەفەردا

ڕۆژوو باش نی یە ، ئەم عامەتایبەتەبەوکەسانەی کەحاڵیان وەك حاڵی ئەوپیاوە وابێت وەنەتوانێت لەسەفەردا بەڕۆژوو بێت ، وەبەڵگەش لەسەرئەم تەخصیص کردنە ئەوەیەکە پێغەمبەرﷺلەسەفەردا بەڕۆژوو دەبوو ، چونکەلەسەری سەخت نەبوو وەبێگومانیش پێغەمبەر ﷺ کارێك ناکات، کە چاکە نەبێت!

عەللامەی مەزن، شێخ ( عەبدولوەهاب خەللاف )، لە کتێبی (علم اصول الفقه)دا، بەم شێوازە باس لە (عام) دەکات، بۆ زیادە سوود و ئیستیفادە لێرەدا دەینووسینەوە:

## ﴿ في العام، و دلالته ﴾

إذا ورد في النص الشرعي لفظ عام ولم يقم دليل على تخصيصه، وجب حمله على عمومه وإثبات الحكم لجميع أفراده قطعاً، فإن قام دليل على تخصيصه وجب حمله على ما بقي من أفراده بعد التخصيص. وإثبات الحكم لهذه الأفراد ظناً لا قطعاً.ولا يخصص عام إلا بدليل يساويه أو يرجحه في القطعية أو الظنية.

تعريف العام:

العام: هو اللفظ الذي يدل بحسب وضعه اللغوي على شموله واستغراقه لجميع الأفراد، التي يصدق عليها معناه من غير حصر في كمية معينة منها، فلفظ (( كل عقد)) في قول الفقهاء: كل عقد يشترط لانعقاده أهلية العاقدين، لفظ عام يدل على شمول كل ما يصدق عليه أنه من غير عقد من غير حصر في عقد

معين أو عقود معينة. ولفظ ((من ألقى)) في حديث: ((من ألقى سلاحه فهو آمن))، لفظ عام يدل على استغراق كل فرد من غير سلاحه من غير حصر في فرد معين أو أفراد معينين.

ومن هذا يؤخذ أن العموم من صفات الألفاظ لأنه دلالة اللفظ على استغراقه لجميع أفراده. وأن اللفظ إذا دل على فرد واحد كرجل، أو اثنين كرجلين، أو كمية محصورة من الأفراد كرجال ورهط ومائة وألف، فليس من ألفاظ العموم . وأن الفرق بين العام والمطلق، هو أن العام يدل على شمول كل فرد من أفراده، وأما المطلق فيدل على فرد شائع أو أفراد شائعة لا على جميع الأفراد. فالعام يتناول دفعة واحدة كل ما يصدق

عليه من الأفراد، والمطلق لا يتناول دفعة واحدة إلا فرداً شائعاً من الأفراد. وهذا هو المراد بقول الأصوليين: ((عموم العام شمولي، وعمومي المطلق بدلي)).

ألفاظ العموم:

باستقرار المفردات والعبارات في اللغة العربية دل على أن الألفاظ التي تدل بوضعها اللغوي على العموم والاستغراق لجميع أفرادها هي:

١-لفظ كل، ولفظ جميع: (( كل راع مسئول عن رعيته))، ( خَلَقَ لَكُم مَّا فِي الأَرْضِ جَمِيعاً )﴿البقرة:٢٩﴾، ((كل خطأ يحدث ضرراً بالغير يلزم فاعله بالتعويض)).

٢- المفرد المعرف بأل تعريف الجنس: (الزانية والزاني)﴿النور:٢﴾، (السارق والسارقة)﴿المائدة:٣٨﴾، (واحل الله البيع وحرم الربا)﴿البقرة:٢٧٥﴾، ((البيع ينقل الملكية))، لأن الجنس يتحقق في كل فرد من أفراده لا في فرد خاص أو أفراد مخصوصين.

٣- الجمع المعرف بأل تعريف الجنس: (والمطلقات يتربصن...) ﴿البقرة:٢٢٨﴾، (والمحصنات من النساء)﴿النساء:٢٤﴾، والجمع المعرف بالإضافة: (خذ من أموالهم صدقة)﴿التوبة:١٠٣﴾، (حرمت عليكم أمهاتكم)﴿النساء:٢٣﴾.

٤- الأسماء الموصولة: (والذين يرمون المحصنات)﴿النور:٤﴾، (واللائي يئسن من المحيض)﴿الطلاق:٤﴾، (وأولات الأحمال أجلهن أن يضعن حملهن)﴿الطلاق:٤﴾، ( وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَاء ذَلِكُمْ )﴿النساء:٢٤﴾.

٥- أسماء الشرط: ( وَمَن قَتَلَ مُؤْمِناً خَطَئاً فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ﴾ ﴿النساء:٩٢﴾، (مَّن ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللّهَ قَرْضاً حَسَناً )﴿البقرة:٢٤٥﴾.

٦- النكرة في سياق النفي أي النكرة المنفية: ((لا ضرر ولا ضرار))، ((لا هجرة بعد الفتح))، ( فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ )﴿البقرة:٢٣٣﴾.

فلكل لفظ من هذه الألفاظ موضوع في اللغة وضعاً حقيقياً للدلالة على استغراق جميع أفراده، وإذا استعمل في غير هذا الاستغراق كان استعمالاً مجازياً، لابد له من قرينة تدل عليه وتصرفه عن المعنى الحقيقي.

## دلالة العام:

لم يختلف الأصوليين في أن كل لفظ من ألفاظ العموم التي بيناها موضوع لغة لاستغراق جميع ما يصدق عليه من الأفراد، ولا أنه إذا ورد في نص شرعي دل على ثبوت الحكم المنصوص عليه لكل ما يصدق عليه من الأفراد، إلا إذا قام دليل تخصيص على الحكم ببعضها. وإنما اختلفوا في صفة دلالة العام الذي لم يخصص على استغراقه لجميع أفراد، هل هي دلالة قطعية أو دلالة ظنية.

فذهب فريق منهم وفيهم الشافعية إلى أن العام الذي لم يخصص ظاهر العموم لا قطعي فيه، فهو ظني الدلالة على استغراقه لجميع أفراده، وإذا خصص كان ظني الدلالة أيضاً على ما بقي من أفراده بعد التخصيص، فهو ظني الدلالة قبل التخصيص وبعده.

ويترتب على هذا أنه يصح تخصيص العام بالدليل الظني مطلقاً، سواء كان أول تخصيص أو ثاني تخصيص، لأن الظني يخصص بالظني، وانه لا يتحقق التعارض بين الدليلين أن يكونا قطعيين أو ظنيين، بل يعمل بالخاص فيما دل عليه، ويعمل بالعام فيما عداه. وحجتهم على ما ذهبوا إليه أن استقرار النصوص الشرعية التي وردت فيها ألفاظ العموم دل على أنه ما من عام إلا وخُصِّص، وعلى أن العام الذي بقي على عمومه نادر جداً، وما استفيد بقاؤه على عمومه إلا من قرينة صاحبته. وإذا كان هذا الشأن والكثير فهو بناء على عام الكثير الغالب محتمل للتخصيص، وعلى هذا فالعام المطلق عن دليل يخصصه ظاهر في العموم لا قطعي فيه.

وذهب فريق منهم وفيهم الحنفية إلى أن العام الذي لم يخصص قطعي في العموم، فهو قطعي الدلالة على استغراقه لجميع أفراده، وإذا خصص صار ظاهراً في دلالته على ما بقي بعد التخصيص، أي ظني الدلالة عليه. ففي هذا المذهب: العام الذي لم يخصص

قطعي الدلالة على استغراقه جميع الأفراد، وإذا خصص صار ظني الدلالة على ما بقي من أفراده بعد التخصيص.

ويترتب على هذا أنه أن يصح العام أول تخصيص بدليل ظني، لأن الظني لا يخصص القطعي، وأنه يصح أن يخصص ثانياً وثالثاً بدليل ظني، لأنه بعد التخصيص الأول صار ظنياً، والظني يخصص الظني، وأنه يتحقق التعارض

بين العام الذي لم يخصص، وبين الخاص القطعي لأنهما قطعيان. وحجتهم على ما ذهبوا إليه ((أن اللفظ العام موضوع حقيقة لاستغراق جميع ما يصدق عليه معناه من الأفراد)). واللفظ حين إطلاقه يدل على معناه الحقيقي قطعاً، فالعام المطلق عن قرينة تخصصه يدل على العموم قطعاً، ولا يصرف عن معناه الحقيقي إلا بدليل، ولهذا استدل الصحابة والتابعون والأئمة والمجتهدون بعموم الألفاظ العامة التي وردت في النصوص مطلقة عن التخصيص، واستنكروا تخصيصها من غير دليل، فإذا خصص العام بدليل دل هذا على صرفه عن متناه الحقيقي وهو العموم، واستعماله معنى مجازي وهو الخصوص، وصار محتملاً لتخصيص ثان قياسياً على التخصيص الأول، لأن علة التخصيص الأول قد تتحقق في أفراد أخرى. ولهذا صار العام الذي خصص ظني الدلالة على ما بقي بعد التخصيص.

والذي يظهر لي بعد المقارنة بين أدلة الفريقين وأمثلتهما وشواهدهما أنه ليس بين رأييهما اختلاف جوهري من الناحية العلمية، لأنه لا خلاف بينهما في أن العام يجب العمل بعمومه حتى يقوم على تخصيصه دليل، ولا في العام يحتمل أن يخصص بدليل، وأن تخصيصه بغير دليل تأويل غير مقبول. والقائلون بأن العام الذي لم يقم دليل على تخصيصه قطعي الدلالة على العموم، ما أرادوا بكونه قطعي الدلالة أنه لا يحتمل التخصيص مطلقاً، وإنما أرادوا أنه ل يخصص إلا بدليل والقائلون بأنه ظني الدلالة على العموم ما أرادوا أنه يخصص مطلقاً، وإنما أرادوا أنه يخصص بالدليل.

أنواع العام:

وقد ثبت باستقراء النصوص أن العام ثلاثة أقسام:

١- عام يراد به قطعاً العموم، وهو العام الذي صحبته قرينة تنفي احتمال تخصيصه، كالعام في قوله تعالى: ( وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي الأَرْضِ إِلاَّ عَلَى اللّهِ رِزْقُهَا)﴿هود:٦﴾، وفي قوله تعالى: ( وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاء كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ)﴿الأنبياء:٣٠﴾، ففي كل واحدة من هاتين الآيتين، تقرير سنة إلهية عامة لا تتخصص ولا تتبدل، فالعام فيهما قطعي الدلالة على العموم، ولا يحتمل أن يراد به الخصوص.

٢- وعام يراد به قطعاً الخصوص، وهو العام الذي صحبته قرينة تنفي بقاءه على عمومه وتبين أن المراد منه بعض أفراد، مثل قوله تعالى: ( وَلِلّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ )﴿آل عمران:٩٧﴾، فالناس في هذا النص عام، ومراد به خصوص المكلفين لأن العقل يقضي بخروج الصبيان والمجانين، مثل قوله تعالى: ( مَا كَانَ لِأَهْلِ الْمَدِينَةِ وَمَنْ حَوْلَهُم مِّنَ الأَعْرَابِ أَن يَتَخَلَّفُواْ عَن رَّسُولِ اللّهِ )﴿التوبة:١٢٠﴾، فأهل المدينة والأعراب في هذا النص لفظان عامان مراد بكل منهما خصوص القادرين، لأن العقل لا يقضي بخروج العجزة، فهذا عام مراد به الخصوص، ولا يحتمل أن يراد به العموم.

٣- عام مخصوص، وهو العام المطلق الذي لم تصحبه قرينة تنفي احتمال تخصيصه، ولا قرينة تنفي دلالته على العموم، مثل أكثر النصوص التي وردت فيها صيغ العموم، مطلقه عن قرائن لفظية أو عقلية أو عرفية تعين العموم أو الخصوص، وهذا ظاهر في العموم حتى يقوم الدليل على تخصيصه، مثل: ( وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ )﴿البقرة:٢٢٨﴾.

قال الشوكاني في التفريق بين العام الذي يراد به الخصوص، والعام المخصوص: العام الذي يراد به الخصوص هو العام الذي صاحبته حين النطق به قرينة دالة على انه مراد به الخصوص لا العموم، مثل خطابات التكليف العامة، فالمراد بالعام فيها خصوص من

هم أهل للتكليف لاقتضاء العقل إخراج من ليسوا مكلفين، ( تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ بِأَمْرِ رَبِّهَا )﴿ الأحقاف:٢٥﴾، فالمراد كل شئ مما يقبل التدمير. وأما العام المخصوص فهو الذي لم تصحبه قرينة دالة على أنه مراد به بعض أفراده، وهذا ظاهر في دلالته على العموم حتى يقوم دليل على تخصيصه.

**تخصيص العام:**

تخصيص العام في اصطلاح الأصوليين: هو تبيين أن مراد الشارع من العام ابتداء بعض أفراده لا جميعها، أو هو تبيين أن الحكم المتعلق بالعام هو من ابتداء تشريعه حكم لبعض أفراده. فحديث: ((لا قطع في اقل من ربع دينار))، تخصيص للعام في قوله تعالى: ( وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا ) ﴿المائدة:٣٨﴾، لأنه تبيين لأن حكم القطع ما شرع لكل سارق وسارقة، وحديث: ((ليس للقاتل ميراث)) تخصيص لعموم الوارث في آيات المواريث، لأنه تبيين لأن حكم الإرث ما شرع لكل قريب.

أما إذا شرع الحكم ابتداء متعلقاً بكل أفراد العام، ثم قضت المصلحة بقصر الحكم على بعض أفراده، وقام الدليل على هذا القصر فلا يسمى هذا في اصطلاح الأصوليين تخصيصاً، وإنما يسمى نسخاً جزئياً، لأنه إبطال العمل بحكم العام بالنسبة لبعض أفراده. فقوله تعالى: ( وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَاء إِلَّا أَنفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ

الصَّادِقِينَ)﴿النور:٦﴾، هو نسخ جزئي للعام في قوله تعالى: ( وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاء فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً )﴿النور:٤﴾، لأن هذه الآية الثانية بعمومها تشمل كل قاذف سواء قذف زوجته أو غيرها، وقد شرع الحكم ابتداء عاماً، ثم قام الدليل وهو آيات اللعان على قصر الجلد على القاذف الذي يقذف غير زوجته. ودل على هذا حديث ابن مسعود قال: كنا جلوس في المسجد ليلة الجمعة إذ دخل أنصاري فقال يا رسول الله، أرأيتم الرجل يجد من زوجته رجلاً، فإن قتله قتلتموه، وإن

تكلم جلدتموه، وإن سكت سكت على غيظ؟ ثم قال ((اللهم افتح))، فنزلت آية اللعان في سورة النور: (والذين يرمون أزواجهم...)﴿النور:٦﴾، الآيات.

ومن هذا ينتج أن التخصيص في اصطلاح الأصوليين لابد أن يكون بدليل مقارن للتشريع العام، لأنه بهذا المقارنة يتبين أن المراد ابتداء من العام بعض أفراده، وأما إذا كان متأخراً عنه فهو نسخ جزئي له.

دليل التخصيص:

ودليل التخصيص قد يكون غير مستقل لفظاً عن نص العام بأن يكون متصلاً به كالجزء منه. وقد يكون مستقلاً عن نص العام، ومنفصلاً عنه.

ومن أظهر الأدلة المتصلة غير المستقلة: الاستثناء، والشرط، والوصف، والغاية.

فالاستثناء كقوله تعالى في آية المداينة، بعد أن أمر بكتابة الدين المؤجل: ( إِلاَّ أَن تَكُونَ تِجَارَةً حَاضِرَةً تُدِيرُونَهَا بَيْنَكُمْ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَلاَّ تَكْتُبُوهَا )﴿البقرة:٢٨٢﴾

والشرط كقوله تعالى: ( وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي الأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ الصَّلاَةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُواْ )﴿النساء:١٠١﴾.

والوصف كقوله تعالى: ( مِّن نِّسَآئِكُمُ اللاَّتِي دَخَلْتُم بِهِنَّ )﴿النساء:٢٣﴾

والغاية كقوله تعالى: ( وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ )﴿المائدة:٦﴾.

ومن أظهر أدلة التخصيص المستقلة المنفصلة: العقل، والعرف، والنص، وحكمة التشريع.

فمن التخصيص بالعقل، ما بيناه من قبل من تخصيص الناس في قوله تعالى:( وَلِلّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ )﴿آل عمران:٩٧﴾، بمن عدا فاقدي الأهلية من الصبيان والمجانين، وتخصيص العام في كل خطاب تكليفي بمن هم أهل للتكليف، وتخصيص أهل المدينة ومن حولهم من الأعراب القادرين على الجهاد مع الرسول، لأن العقل يقضي بأن يوجه الخطاب إلى من هم أهل له، وأن يخص الذي يقتضيه العقل، وعلى هذا أصول القوانين الوضعية.

ومن التخصيص بالعرف، تخصيص الوالدات في قوله تعالى: ( وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلاَدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ )﴿البقرة:٢٣٣﴾، بمن عدا الوالدة الرفيعة القدر، التي ليس من عادة مثلها أن تلزم بإرضاع ولدها، كما ذهب إلى هذا الإمام مالك. وتخصيص الطعام في حديث نهي رسول الله عن بيع الطعام بجنسه متفاضلاً بالطعام الذي كان متعارفاً إطلاق لفظ الطعام عليه وقت التشريع. وتخصيص كل شئ في قوله تعالى: ( تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ بِأَمْرِ رَبِّهَا )﴿الأحقاف:٢٥﴾، بكل شئ قابل للتدمير. وبعض الأصوليين يعتبر دليل التخصيص في المثال الأخير الحس، وبعضهم يعتبره العقل والنتيجة واحدة،

وعلى هذا أصول القوانين الوضعية، فكثيراً ما يخصص العرف بعض الألفاظ العامة في مواد القانون، وكثيراً ما يخصص العرف التجاري بعض النصوص العامة في صيغ العقود.

ومن التخصيص بالنص، ما أشرنا إليه من قبل في مواضع كثيرة، كقوله تعالى في المطلقات قبل الدخول: ( فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا ) ﴿الأحزاب:٤٩﴾، الذي خصص عموم قوله سبحانه: ( وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوَءٍ)﴿البقرة:٢٢٨﴾.

ولا خلاف بين الأصوليين، في أنه يجوز تخصيص عام القرآن بالقرآن وبالسنة المتواترة، لأن نصوص القرآن والسنة المتواترة قطعية الثبوت، فيخصص الأصوليين على بعضها بعضاً، وأما تخصيص القرآن بالسنة غير المتواترة، فذهب جمهور الأصوليين إلى أنه سائغ، واحتجوا بوقوعه والاتفاق على العمل به، فحديث ((هو الطهور ماؤه الحل ميتته))، خصص عموم قوله تعالى: ( حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ )﴿المائدةك٣﴾، وحديث: ((ليس للقاتل ميراث)) خصص عموم الوارث في آيات المواريث، وحديث الرجم خصص عموم الزاني والزانية، وحديث ((لا قطع في أقل من ربع دينار)) خصص عموم السارق والسارقة، وحديث ((يحرم من الرضاع ما يحرم من النسب)) خصص عموم ( وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَاء ذَلِكُمْ )﴿النساء:٢٤﴾. ودعوى تواتر بعض هذه الأحاديث أو شهرتها لا يقوم عليها دليل، وهذا المذهب هو السديد، والذين منعوا تخصيص عام الكتاب بالسنة

غير المتواترة يصطدمون بعدة تخصيصات نبوية، لا سبيل لهم إلى إنكارها، ولا إلى تأويلها، ولا إلى إثبات تواترها.

وتخصيص نصوص في القوانين الوضعية لنصوص فيها كثير. فمن ذلك المادة ١٦٤ من القانون المدني، التي تجعل التمييز مناط المسؤولية عن العمل غير المشروع وتعويض ما ينجم عنه من ضرر، وقد خصت بفقرتها الثانية إذ تقرر انه إذا وقع الضرر من شخص عديم التمييز ولم يكن من يسال عنه، أو تعذر الحصول على تعويض من المسئول، فغنه يجوز للقاضي إلزام من وقع منه الضرر بتعويض عادل.

## العبرة بعموم اللفظ لا بخصوص السبب:

إذا ورد النص الشرعي بصيغة عامة وجب العمل بعمومه الذي دلت عليه صيغته، ولا اعتبار لخصوص السبب الذي ورد الحكم بناء عليه، سواء كان السبب سؤالاً أم واقعة حدثت. لأن الواجب على الناس إتباعه، هو ما ورد به نص الشارع، وقد ورد نص الشارع بصيغة العموم فيجب العمل بعمومه، ولا يعتبر خصوصيات السؤال أو الواقعة التي ورد النص بناء عليها، لأن عدول الشارع في نص جوابه أو فتواه عن الخصوصيات، إلى التعبير بصيغة العموم قرينة على عدم اعتباره تلك الخصوصيات.

روي أن قوماً قالوا: يا رسول الله إنا نركب البحر، ولو توضأنا بما معنا من الماء خشينا العطش، أنتوضأ بماء البحر؟ فقال الرسول: ((هو الطهور ماؤه الحل ميتته))، فهذه الصيغة العامة ـ هو الطهور ماؤه ـ تدل بعمومها على أن ماء البحر مطهر كل أنواع الطهور في حال الضرورة والاختيار. فيجب العمل بعمومها، ولا عبرة بكون السؤال ورد خاصاً عن التوضؤ، ولا بكون السائلين سألوا عن حال ضرورتهم من الماء خشية العطش.

وروى أن امرأة سعد بن الربيع قالت: يا رسول الله، هاتان ابنتا سعد بن الربيع، قتل أبوهما معك في أحد، وقد أخذ عمهما مالهما، ولا تنكحان إلا ولهما مال، فقال الرسول لعم البنتين: (( أعط البنتين الثلثين وللزوجة الثمن، وما بقي فهو لك))، فهذا الحديث يدل على أن لبنتي المتوفى الثلثين، ولا اعتبار لكونهما لا مال لهما أو لكون أبيهما قتل في احد.

وروى انه ﷺ مر بشاة ميمونة وهي ميتة فقال: ((أيما إهاب دبغ فقد طهر))، فكل جلد دبغ صار طاهراً ولا اعتبار لخصوص جلد الشاة.

قال الآمدي في الإحكام: أكثر العموميات وردت على أسباب خاصة. فآية السرقة نزلت في سرقة المجن أو رداء صفوان، وآية الظهار نزلت في حق مسلمة بن صخر، وآية اللعان نزلت في حق هلال بن أمية، إلى غير ذلك. والصحابة عمموا أحكام هذه الآيات من غير نكير، فدل ذلك على أن السبب غير مسقط للعموم.

نعم إذا ورد جواباً غير مستقل بنفسه عن السؤال بأن كان الجواب نعم، أولا ، أو ما في معنى أحدهما، فمثال ما روي أن رسول الله سئل عن بيع الرطب بالتمر، فقال: ((أينقص الرطب إذا يبس؟)) قالوا: نعم، قال: ((فلا إذا))، وأما في خصوصه فمثاله قول الرسول لأبي بردة وقد سأله عن الأضحية بجزعة من المعز: ((تجزئك ولا تجزئ أحدا بعدك))، فما دام الجواب الشرعي عن السؤال ورد تابعاً للسؤال في عمومه وخصوصه، وكان السؤال معاد في الجواب.

وأما الجواب المستقل إذا ورد عاماً فهو عام ولا عبرة بخصوصيات سببه، وعلى هذا أصول القوانين الوضعية، فمادة تحديد سن الزواج عامة، ولا عبرة بخصوصيات الواقعة، أو الوقائع التي كانت سبب قي تشريعها. والمواد التي

منعت سماع دعوى الزواج أو الطلاق أو النفقة في بعض الحالات عامة، ولا عبرة بخصوصيات الوقائع التي كانت سبباً في تشريعها. والمادة ١١٥ من الدستور التي كانت

التجديد النصفي كل خمس سنوات عامة، ولا عبرة بخصوصيات السبب الذي بني عليه تشريعها، لأن السبب كما قال الشافعي لا يصنع شيئاً، إنما تصنع الألفاظ.

ويلاحظ الفرق بين حكمة تشريع النص وبين ما ورد النص بناء عليه من سؤال أو واقعة، فإن حكمة تشريع العام قد تخصصه بلا خلاف، وأما ما ورد النص بناء عليه فهو المراد بقولهم: لا عبرة بخصوص السبب مع عموم اللفظ.

## ﴿التخصيص﴾

تخصيصهم تميز بـعض الجملة — قبل العمل بالشرط، أو بـالصفة
و يحمل المطلق يا من فصـلنا — عـلـى مقيَّد بها، إن أمكنا
وخصصوا ايضا بالاستثنا ولا — بدَّ، لديهم أن يـكـون موصلا
وغيرمستغرق ثـم المنقطع — يجوز كالتقديم قطعاً، فـاستمع
وخصص الكتاب بالسنة وبه — و هي بما ثم، به فـكـن نبه
ثم هما يخصصان بـالقياس — ذا رجـع اليهما هما الاساس
و عطف ما عمم على ما خصصا — وعكسه فلم يـكـن مخصصا

---

***خاص :*** تایبەت : دژی عام ( گشتی یە ) وەئەولەفزەدەگرێتەوە کەلەکاتی ئاڕاستە کردنیدا کەسێك یان ژمارەیەك لەعامی گوتراوەکە جیادەکاتەوە ،ئیتربەناوبێت یان بەئاماژەبێت ، یان بەژمارەبێت ، چون یەکە ، لێرەشەوەدەبێت بەدوو بەشەوە ، ( متصل : لکاو ) و ( منفصل : پچڕاو ) وەك لەم وێنانەدا دەردەکەوێت .

*المخصص المتصل : ئەوەیەکە سەربەخۆنی یەو بەستراوە بەشتی ترەوە ، لەم سێ شێوازەدا دەردەکەوێت :

یەکەم : الاستثناء : کەبریتی یە لەجیاکردنەوەی چەندشتێ لەعامی شتەکان ، بەهۆی ( ألا ) و خوشکەکانی یەوە وەك ئەم ئایەتە پیرۆزەکەدەفەرموێت: ( ان الانسان لفی خسر).

مەرجەکانی أستثناء : پێویستە چەنجدمەرجێك بێتە دی ئەوانیش :

١–لەڕووی حەقیقەت یان لەڕووی حوکمەوە لکابێت بە ( مستسنی ) وە ،

–متصلی حەقیەت : ئەوەیەکەڕاستەوخۆلکابێت بە (مستسنی منە)، بە بێ بوونی ناوبراو.

–متـصلی حـوکمی : ئەوناوبڕەیەکەدروسـت بـووە لـەنێوان ( مـستثنی ) و (مـستثنی بە)،دا، بەڵام کاریگەری نابێت وەك ( کۆکەو پژمین ) . بۆیەئەگەرئەوناوبڕە زۆربوو یـان بێدەنگی زۆر لـەنێوان ( مـستثنی ) و ( مـستثنی بـە ) درووسـت بـوو ئـەوا ( الاسـتثناء ) درووست نی یە ،وەك ئەوی بڵێیت ( بەندەکانم ئـازادکرد ) و دواتـر بێـدەنگ ببیـت یـان بـچیتەسەر ووشـەیەکی تـرو دووای ئـەوە بڵێیـت ( تـەنها نـەوزاد نـەبێت ) ئـەوا ئـەو ( الاسـتثناء ) درووسـت نـی یـە ،بۆیـە بڕیـاری یەکـەم کـاری پـێ دەکرێـت و سـەرجەم بەندەکانت ئازادبوون . هەندێکیش ووتویان ( استثناء ) لەگەڵ بـێ دەنگـی و ناوبڕیـشدا هەردرووستە ،ئەگەر هاتوو تێکڕای قسەکە یەکێك بوو

٢–نابێت ( مستثنی ) لەنیوە زیاتری (مستثنی منه) بێت، بۆیە ئەگەر کەسێك ووتـی ( دەدینارت لەسەر من جگە لەشەشی ! ) ئەوەلە (استثناء) کردنی درووست نی یە بـەڵکو دەبێت هەردەدینارەکـەی بۆبـدات .وەهەنـدێکیش ووتویانـە درووسـتەو هـیچ گرفتێکـی تیانی یە هەرچەندە (مستثنی) ش لەنیوەی زیاتر بوو وەلەو نموونەیەی شـەرەوە تـەنها چواردیناری لەسەرەوهیچی تر ! بەڵام ئەگەر هەمووی (اسـتثناء) کـرد بۆنموونـە ووتـی: (دە دیناری تۆلەسەر من جگەلەدەدیناری ) ئـەوە هەردەدینارەکـەی لەسـەر دەکـەوێت دەبێت بیداتێ ! ئەو مەرجانەی سەرەوە

بۆجـۆرە (استثناء) یـەکن کـە لـە ( عـدد ك ژمـارە ) دا بێـت بۆیـە وە ئەگـەر لەصـفە ئاوەڵناودا بوو هەمووی یان زۆرینەی (استثناء) کرد ئەوا هەردرووستە ، وەك لەم ئایـەت پیرۆزەدا دەردەکەوێت کەدەفەرموێت: (إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ إِلاَّ مَنْ اتَّبَعَكَ مِـنْ الْغَـاوِينَ)، کـە بێگومـان شـوێنکەوتنی شـەیتان لـەناو مرۆڤەکانـدا زیـاترەو شـوێن کەوتەی زۆرن ، وەیان لەنموونەی ئەوەدا بڵێین: (چی لەو ماڵەدایە هاوکـاری بکـە جگـە لەدەوڵەمەندەکان)، و دواتر دەرکەوت هەموودانیشتوانی ئەو ماڵە دەوڵەمەنـدبوون ئـەوا (استثناء) کردنەکە هەردرووستەو هیچکامیان هاوکاری ناکرێن .

دووەم : له ( مخصص المتصل ) : (الشرط)ـه، كه ئەویش بریتی یه لەبەستنەوەی لەفزێك بەمەرجێكەوە لەڕێی (أن)ـی، شەرطییەوە، یان خوشكەكانی یەوە ئەگەر چوون یەكە ئەوشەرتەدوابكەوێت یان پێش بكەوێت ، نموونەی پێش خستنی وەك لەم ئایەتـە پیرۆزەدا سەبارەت بەهاوەڵ بڕیاردان كەدەفەرموێت ( فأن تابوا وأقاموا الـصلاة واتـوا الزكـاة ، فخلـوا سـبيلهم)، وە نموونـەی دواكـەوتنی شـەرت، وەك ئـەم فەرمایـشتەی پەروەردگار كەدەفەرموێت: ﴿وَلْيَسْتَعْفِفْ الَّذِينَ لاَ يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّى يُغْنِـيَهُمْ اللَّـهُ مِـنْ فَضْلِهِ وَالَّذِينَ يَبْتَغُونَ الْكِتَابَ مِمَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا وَآتُـوهُمْ مِنْ مَالِ اللَّهِ الَّذِي آتَاكُمْ وَلاَ تُكْرِهُوا فَتَيَاتِكُمْ عَلَى الْبِغَاءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَـصُّنًا لِتَبْتَغُـوا عَـرَضَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَمَنْ يُكْرِهُّنَّ فَإِنَّ اللَّهَ مِنْ بَعْدِ إِكْرَاهِهِنَّ غَفُورٌ رَحِيمٌ(٣٣) سورة النور﴾.

سێیەم : له ( المخصص المتصل ) بریتی یه لەصیفەت ، ئـەویش ئەوەیەكەبـەهۆی سیفەتێكەوە بەشێك لەتاكەكانی عامێك جیابكاتەوە لەڕێی ( نعت ) یان ( بدل ) یان ( حال ) ەوەبێت ، نموونەی ( نعت ) وەك ئایـەتی ( فممـا ملكـت أيمـانكم مـن فتـايتكم المؤمنات ) وەنموونەی ( بدل ) وەك ئایـەتی (وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْـتِ مَـنْ اسْـتَطَاعَ إِلَيْـهِ سَـبِيلاً وَمَـنْ كَفَـرَ فَـإِنَّ اللَّـهَ غَنِـيٌّ عَـنْ الْعَـالَمِينَ) وەنموونـەی (حـال)، وەك ئـەم فەرمایشتەی پەرووەردگار كه دەفەرموێت: ( ومـن يقتـل مؤمنـا متعمـدا فجـزاءه جهـنم خالدا فيها ) .

*المخصص المنفصل: ئەوەیه كەلەخودی خۆیدا سەربەخۆی هەیەو بەگشتی شته ( الحـس : هەسـت ) ، ( العقـل : ژیـری ) ، ( الـشرع : شـرع ) . نموونـەی تەخصیـصی هەسـتی وەك ئـەم فەرمایـشتەی پـەروەردگار دەربـارەی ڕەشـەباكەی هـۆزی عـاد كەدەفەرموێت: ﴿تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ بِأَمْرِ رَبِّهَا فَأَصْبَحُوا لاَ يُرَى إِلاَّ مَسَاكِنُهُمْ كَذَلِكَ نَجْـزِي الْقَوْمَ الْمُجْرِمِينَ(٢٥) سورة الأحقاف﴾.

کە هەست لێرەدا بەڵگەیەلەسەرئەوەی کەئەو بایە بەهێزە ( ئاسمان و زەوی) وێران نەکردووە، نموونەی تەخصیصی عەقڵی، وەك ئەم ئایەتە پیرۆزە کە دەفەرموێت: ( الله خالق كل شيئ – زمر ٦٣ ) کەلێرەدا عەقڵ دەبێتە بەڵگەلەسەر ئەوەی کەخودی زاتی پەروەردگار درووستکراو نی یە . هەرچەندە هەندێك لەزانایان تەخصیصی عەقڵی و هەستی یان بەعامی مەخصووص دانەناوە لەم نێوەندەدا گرفتیان هەیە کەلەکتێبەگەورەکاندا باسکراوە ، بەلاَم سەبارەت بەتەخصیصی شەرعی بێگومان کەقورئان و سونەت هەریەکەیان بەیەکترو بە اجماع و بەقیاس تەخصیص

دەکرێن وەك لەم نموونانەی خوارەوەدا ڕون دەبێتەوە :

١–تەخصیصی قورئان بەقورئان : وەك ئەم فەرمایشتەی پەروەردگار کەدەفەرموێت:﴿وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلاَثَةَ قُرُوءٍ وَلاَ يَحِلُّ لَهُنَّ أَنْ يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ اللَّهُ فِي أَرْحَامِهِنَّ إِنْ كُنَّ يُؤْمِنَّ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَلِكَ إِنْ أَرَادُوا إِصْلاَحًا وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌالبقرة، ٢٢٨﴾، کەلێرەدا ئەم ئایەتە سەرجەم ژنانی تەلاَق دراو دەگرێتەوە ، لەهەرباروذۆخێدا بن بەلاَم ئەم حوکمە عامە بە ئایەتی: (وَاللاَّئِي يَئِسْنَ مِنَ الْمَحِيضِ مِنْ نِسَائِكُمْ إِنْ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلاَثَةُ أَشْهُرٍ وَاللاَّئِي لَمْ يَحِضْنَ وَأُوْلاَتُ الأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَنْ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مِنْ أَمْرِهِ يُسْرًا، طلاق٤)، و ئایەتی (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمْ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلاً، احزاب ٤٩) تەخصیص کراوە بڕیاری سێ ( قرء ) تایبەت بەژنانی تەلاَق دراوە ، نەك سك پڕو تەلاَقدراوی دەست لێ نەدراو .

٢–تەخصیصی قورئان بەسوونەت : وەك ئایەتەکانی میرات بردن کەدەفەرموێت: (يُوصِيكُمْ اللَّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ فَإِنْ كُنَّ نِسَاءً فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ وَإِنْ كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ وَلأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِنْ كَانَ لَهُ وَلَدٌ فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ الثُّلُثُ فَإِنْ كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ السُّدُسُ

مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا أَوْ دَيْنٍ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ لاَ تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعًا فَرِيضَةً مِنْ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ

عَلِيمًا حَكِيمًا– نساء: ١١ )، کە بە فەرمودەی ( لايرث المسلم الكافر ولاالكافر المسلم)، موسڵمان میرات لە کافر نابات، و کافریش میرات لە مسوڵمان نابات – متفق عليه)، تەخصیص کراوە.

٣–تەخصیصی قورئان بە ئیجماع : وەك فەرمودەی پەروەردگار کەدەفەرموێت: (وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلاَ تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا وَأُوْلَئِكَ هُمْ الْفَاسِقُونَ) سورة النور: ٤ کە ئیجماع لە سەر ئەوەیە کە بەندەی تۆمەتکار ( ٤٠ ) جەڵدی لە سەرە، و ئەو دەقە بەم ئیجماعە تەخصیص کراوە .

٤–تەخصیصی قورئان بە قیاس : وەك ئەم ئایەتە پیرۆزە: (الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ وَلاَ تَأْخُذْكُمْ بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِنْ كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ نور: ٢) کەلێرەدا بەقیاس کردنی بەندەی زیناکار لەسەرکەنیزەك سزازەکەی کورت دەکرێتەوە، بۆ پەنجا جەڵد.

٥–تەخصیصی سوننەت بە قورئانی پیرۆز : وەك ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەرﷺکە دەفەرموێت: ( امرت ان اقاتل الناس حتى يشهدوا ان لا اله الا الله، و ان محمدا رسول الله – فەرمانم پێکراوە کەشەڕی خەڵکی بکەم تاشایەتومان دەهێنن – متفق عليه)، کە بە فەرمایشتی پەروەردگار تەخصیص کراوە، و دەفەرموێت: (قَاتِلُوا الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَلاَ بِالْيَوْمِ الآخِرِ وَلاَ يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَلاَ يَدِينُونَ دِينَ الْحَقِّ مِنْ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ حَتَّى يُعْطُوا الْجِزْيَةَ عَنْ يَدٍ وَهُمْ صَاغِرُونَ التوبة: (٢٩).

٦–تەخصیصی سونەت بەسونەت : وەك ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەرﷺکە دەفەرموێت ( فيما سقت السماء العشر ) لەوکشتوکاڵەی کەباران ئاوی دەدات دەیەك

دەدریٚ لەزەکاتیا – رواه البخاری)، کە بە فەرموودەیەکی تر تەخصیص کراوە، کە دەفەرمویٚت: ( لیس فیما دون خمسة اوسق صدقة)،

لەو بەرووبومانەی کەکەمتر لەپیٚنج و ویسق ( ٦٠صاع ) زەکات نی یە – متفق علیه).

٧-تەخصیصی سوننەت بە قیاس : وەك فەرموودەی: ( البکر بالبکر جلد مئه، و تغریب عام: ددکورِ و کچی زیناکار، سەد دارلیٚدان، و دوور خستنەوە یان لە وولاٚت سزایانە – رواه احمد ومسلم)، کە بە قیاس بەندە(عبد)، لە سەر کەنیزەك (أَمَة)، تەخصیص کراوە، کە سزای ئەمەیان کورت کراوەتەوە بۆنیوەی سزاکەی ، واتە: پەنجا جەڵد .

﴿ المجل والمبين، و هو النص ﴾

وكـــــــــل محتاج إلى البيان فمـجمل عند، ذوي الـعـــرفان
خـــــلافـــه المبين النص فذا لـــغيـــر معنى واحد، ما أخذا

## ﴿ باسی موجمەل و موبەییەن ﴾

***المجمل*** : بەمانای نادیار دێت کەماناکەی بەهۆی شتی ترەوە دەربکەوێت ، وەخۆی لەخۆیداشاراوەبێت ، کەپێویستی بەدیاری کردن یان ڕوونکردنەوەی صیفەتەکەی هەبێت ، یان پێویستی بەدیاری کردنی ئەندازەکەی هەبێت ، تاماناڕونەکەی دەربکەوێت ، نموونەبۆئەوەیان کەپێویستی بەغەیری خۆی هەیە لەدیاری کردنیدا وەك ئەم ئایەتپیرۆزەکەدەفەرموێت ( والمطلقات يتربصن بأنفسهن ثلاثة قروء ) کەلێرەدالەفزی ( قروء ) لەفزێکی هاوبەشە لەنێوان (حیض) و (طهر)دا، و پێویستی بەوە هەیە، کە یەکێك لەو مانایانە یان دیاری بکەین، بە بەڵگەوە، نموونە بۆ ئەوەیان کە پێویستی بە غەیری خۆی هەیە لە ڕوونکردنەوەی صیفەت و شێوازەکەیدا وەك ئەم فەرمایشتەی پەروەردگار کەدەفەرموێت ( وأقيموا الصلاه ) کەچۆنی یەتی کردنی نوێژ نادیارە پێویستی بەڕوونکردنەوە هەیە ، نموونەبۆئەوەیان کەپێویستی بەغەیری خۆی هەیە تائەندازەکەی دیاری بکات وەك ئەم ئایەتە پیرۆزە کە دەفەرموێت: ( و اتوا الزكاة)، کە بێگومان ئەندازەی زەکاتی دیاری کراو نادیرەوپێویستی بەڕوونکردنەوەیەك هەیە تائەندازەکەی دیاری بکات.

***المبين:*** ڕوونکەرەوە، و ڕاڤیارە، کە زیاتر ئەو زاراوانە دەگرێتەوە، کە لە خودی خۆیاندا، یان دوای ڕوونکردنەوەی دەردەکەوێت، کە چ مانایەکیان هەیە، وەك لەفزەکانی ( السماء: ئاسمان ) و ( الجبل: شاخ ) و (الظلم: ستەم)، و هی تریش، کە

لە خودی خۆیاندا مانا بەخشن، و دەزانین کە بۆ چ مانایەك دانراوون، نموونە بۆ ئەوەی کــەدوای ڕوونکردنـــەوە دەردەکـــەوێت چ مانایـــەك مەبەســـتەتیایدا وەك ئـــەم ئایەتپیرۆزەکەدەفـەرموێت ( وأقیمـوا الـصلاة واتـوا الزکـاة ) کـەبێگومان ( اقامـة : بەرپاکردن ) و ( ایتاء : پێدان ) لەنوێژوو زەکاتدا نادیـارە، بـەڵام شـەرع هـەردووکیانی ڕوونکردۆتەوە، بۆیە دوای ئەو ڕوونکردنەوەیە بوونەتە ( مبین ) .

کارکردن بەموجمەل : لە سەر کەسی موکەللەف پێویستە ، کە بڕیار بدات، لە سـەر کـارکردن بــە موجمـــەل، هـــەر کـــات کـــە ڕوونکردنـــەوەی دەرکـــەوت ، و پێغـــە مبـەریش ﷺ سـەرجەمی شـەریعەت بـۆ ئومەتەکـەی ڕوونکردنـەوەی ، بـە یـە مـاو لقـە کانیەوە . وئەم گەلەی لە سەر ڕوونی بە جێهێشتوە شەوی وەك ڕۆژ لێکردووە بۆ یان ، و قەت لە سەر هیچ کارێك بـەبێ قسەکردن لـە سـەری بـەجێی نـە هێشتوون لـەو شتانەیدا کە پێویستە بۆ یان ، و ڕوونکردنەوەی پێغە مبـەریش ﷺ یـان فەرمایـشتە ، یان بە کرداری یان بە هەردووکیانە .

ـ نموونە ڕنکردنەوەی پێغە مبەر ﷺ بە قسەی وەك هەوڵدانی ئەو بـە ئەنـدازەو بـڕی زە کات ، وەك لە فەرموودەیدا هـاتووە کـەدە فـەرمێت : (فیمـا سـقت الـسماء العـشر) ئـەوەی کـەباران ئـاوی دەدات ،دەیـەك تیایـدابڕی زەکاتــە ، کەئــەم فەرمودەیــەش ڕوونکردنەوەی ( مبیین ) ە . بۆدەقی ئایەتی ( واتوا الزکـاة ) کەموجمەلـە . ــ نموونـە ڕوونکردنەوەی پێغە مبەر ﷺ بەکرداری وەك

هەستانی ئەوزاتە بەپێویستیە کانی حەج کـردن بـە کـرداری بـە بەرچـاوی ئوممەتـە کەیەوە ، وەك ڕوونکردنەوەیەك بۆ مو جمەلاتی ئایەتی (ولله علی الناس حج البیـت ) ، و هەروەها هەستان بە نوێژی خۆر گیران بەو شێوازەی کـە هەیـە ، و بـەکرداری ، وەك ڕوونکردنەوەیەك بۆ فەرمایشتی (فاذا رأیتم منها شیئاء فصلوا).

ـ نموونە ڕوونکردنـەوەی پیغـە مبـەر ﷺ بـۆ مـو جمـەلات ، بـە گوفتـاروکردار وەك ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی بەرپا کردنی نوێژ کە بە گۆفتار فەرموویەتی: وەك ئەوەی کـە

کەسێك بە ناجوانی نوێژی کرد،پێغە مبەر ﷺ پێی فەرموو: (أذا قمت ألی الصلاة فاسبغ الوضوء ثم أِستقبل القبلة فکبر)، و بە کرداریش وای کردووە، وەك کە فـە رموودەکـەی (سهل بن سعد الساعدی )دا هاتووە، کە پێغە مبەر ﷺ هەستا چـووە سـەر میمبـەر، و تەکبیری نوێژ دابەستنی کردن و خەڵکیش لە دوایەوەکردیان، و ئەو لە سـەر دوانگەکـە بوو، و هەروەها

دواتـر ئـەڵێ ڕووی کـردە خەڵکەکـە، و فـەرمووی: ئەمـەم بۆیـە کـرد، تـا لـە گـەڵما نوێژەکە بکەن، و فێری شێوازی نوێژی من ببن!

## ﴿الظاهر و المؤول﴾

| | |
|---|---|
| ما أحتمل الأمرين، أن يحمل عـلـــى | أظهر فهوظاهر، قـــــد انجلا |
| و ما على الاخر،قطعا يـحـمـــل | أي بـدليل ، فَأِسْمُهُ الـمُؤَوَّلُ |

***الظـاهر*** : بەمانای ڕون وئاشكرادێت كەلەخۆیدامانایەك بدات بەدەستەوە ، بەلاَم ئیحتمالی تریش بگرێتە خۆی، بۆ نموونە لە فەرمودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە، كە دەفەرموێت: (توضؤا من لحوم الابل – دەست نوێژ لە گۆشتی حوشتر بشۆنەوە، كە دەستان دالێی – رواه أحمد، و أبو داود).

كە لە ظاهیردا مەبەست لە دەست نوێـژ گرتنـەوە، لەم فەرمودەیەدا شۆردنی چوارپەلە بەو شێوازەی كە شەریعەت داوای كردووە، نەك دەست نوێـژێك كەمەبەست لێی پاك و خاوێنی بێت وتەواو ! یاخود ووشەی ( أسد:شێر ) كەمانای ئاژەڵی شێردەگەیەنێت ، هەروەهامانای مرۆڤی ئازاش دەدات بەدەستەوە ئەمەلەڕووی زمانەوە ئەم جیاوازی یە لەڕووی شەرعیەشی یەكەشەوە هەیە ، وەك ووشەی ( صلاة ) كەبۆنوێژلای شەرع ناسان و بەمانای ( دوعا ) لای زمانەوانان دێت .

كاركردن بە ظاهیر: كاركردن بە ظاهیر واجبە مەگەربەڵگەیەك پەیدابێت كە لەو ظاهیر بوونە بیگۆڕێت ، وەئەمەش ڕای زانایانی سەلەف و ڕێگایەكی دروستەبۆخواپەرستی وملكەچ بوون بۆبڕیارەكانی شەریعەت .

*المُؤَوَّل : بەوزاراوەیەدەگوترێت كەماناكەی دەبرێتەسەر ماناخوازراوەكە ، بۆنموونە كەخوای پەروەردگار لەقورئاندا هێناویەتی دەفەرموێت : ( و اسئل القرية : پرسیارلەگوندەبكەن ، كەبێگومان مانای ( واسئل أهل القرية : پرسیارلەخەڵكی ئەو گوندە بكەن ) دەگەیەنێت ، چونكە ( گوند ) خۆی

لەخۆیدا پرسیاری لێناکرێت، بەڵکو پرسیار ناڕاستەی خەڵکی گوند دەکرێت، ئەمەش نموونەیەکە لە نموونەی (المُؤَوَّل) دروست ، نموونەی (المُؤَوَّل) نادرووست واتەگۆڕینی مانابەشێوازێك کەلەلایەن زانایانی سەلەف درووست نی یەو نەگونجاوە وەك گۆڕینی مانای ( الرحمن على العرش استوى ) کەهەندێك لەفیرقەی ( معطلة ) و ( أشاعرة ) دەڵێن ( استوى ) بەمانای (أستولی) هاتووە ، بەلاّم لەڕاستیدا ئەمەدروست نی یە وبەڵکوبەمانای ( العلو والاستقرار ) هاتووە ، بە بێ شوبهاندن و چواندن ، هەروەك ( شێخ عثيمين ) لە کتێبی ( الاصول من علم الاصول ) دا فەرموویەتی، بۆیە سەلەفییەکان دەڵێن : خوای پەروەردگار لە عەرشە، بەلاّم ( الاستواء معلوم، و الكيف مجهول، والسؤال عنه بدعة، و الايمان به واجب)، کەواتە نەبوونی مەکان بۆخوا قسەیەکی هەڵەیە، ئەمەش بیروڕای ئیمام ئەبو حەنیفە، و ئەحمەد، و شافیعی، و سەعد بن موعاز، و سوفیان، و ثەوری، و عبدالله بن موبارەك، و ئیسحاق ڕاهەوەیهی، و بوخاری، و تیرمیزی، و ئەبوداوود)ـــە".

---

١١ بڕوانە تفسير الالوسى ١٦ / ١٥٦، و شرح النسفيه ، شێخ عبدالملك سعدى،ل ٦٨ و الله تعالى أعلم

﴿ النسخ ﴾

النسخ أن يرفع حــكم الشرع و قيدوا ذا، بـــــدليل شرعي
ثم الـــــــى أربعة قد قسما الـــــــى اخف اغلظ فلتعلما
و بدل، و غيره، و قـــد نقل نسخ كتاب، بــكــتاب لا تضل
كذلك بالسنة، و هـــي بهما فـــــاجتنب الغفلة، كيما تفهما

## باسی نەسخ

نەســخ : بــەمانای ســڕینەوەو لابــردن و گواســتنەوەدێت بەومانایــەی کــەحوکمی بەڵگەیــەکی شــەرعی یــان لەفزەکــەی لابــدرێت ، بەبەڵگەیــەکی ترلــەقورئان و ســونەت ،ئیترئەولادان و گۆڕانەش دەبێت لەحاڵەتێکەوەبۆحاڵەتێکی تر ،وەك لە ( وجوب ) بۆ ( أباحة ) یان لە ( أباحة ) بۆ ( تحریم ) وەهی تریش ، بەلاّم دەبێ ئاگاداری ئەوەش بـین کـە هاتنــەدی مــەرج یــان بــوونی بــەرگر لەحوکمـدا نابنــە نەســخ بۆوێنــە ، نەگەیــشتنی (نصاب) لە زەکاتدا، کە مەرجی زەکاتدانەکە نەهاتەدی، ئیتر ئەو کەسە، ئەو زەکاتەی لە سەر نییــە، ئەمــە بــە نەســخ نایەتــە ئــەژمار، کــە مــەرجێکی تیــادا نــەبووە، یــاخود ئافرەت کە لە ماوەی بێنوێژیدا بوو، نوێژی لە سەر نایەت، ئەمە ئــەوە ناگەیــەنێت، کــە ئــیتر واجــب بــوونی نوێــژ نەســخ کرابێتــەوە ! بۆیــە بــە نەســخ حیــساب ناکرێــت، وەهەروەهادەبێ ئەوەبزانین کەنەسخ بەقورئان و سونەت ئەکرێت وەبەبەڵگــەکانی تــری ( ئیجماع وقیاس ) بێ ئەوانەنەسخ درووست نابێت .

*<u>حوکمی درووستی نەسخ</u>: نەسخ لەڕووی عەقل و شەریعەتەوە درووستەو دەکرێت، بــۆ نموونــە، لــە ڕووی عەقڵــەوە، چــونکە ســەرجەم کاروبــار لــە دەســتی پــەروەردگار خۆیەتی وەحوکمی تەنهاهی ئەوزاتەیە ، وە تەنها ئەو بەرژەوەندی مرۆڤــەکان بەباشــی دەزانێت ، وەبۆیەدەبێت جیٚ گۆڕکیٚ و ...

نەسخ لەحوکمەکانـدا وەك میهرەبـانی یـەکی خـۆی بۆبەنـدەکانی ئـەنجام بـدات ، وەلەشەرعیشدا درووستە ، چونکەپەروەردگارخۆی لەقورئانی پیرۆزدائاماژەی پێداوە ، کەدەفەرموێت: (مَا نَنسَخْ مِنْ آيَةٍ أَوْ نُنسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِنْهَا أَوْ مِثْلِهَا أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، البقرة:(١٠٦)، یـان دەفـەرموێت : (الآنَ خَفَّـفَ اللَّـهُ عَـنكُمْ وَعَلِـمَ أَنَّ فِيكُمْ ضَعْفًا فَإِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ مِائَةٌ صَابِرَةٌ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ وَإِنْ يَكُنْ مِـنْكُمْ أَلْـفٌ يَغْلِبُـوا أَلْفَـيْنِ بِإِذْنِ اللَّهِ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ) یان (فَالآنَ بَاشِرُوهُنَّ وَابْتَغُوا مَا كَتَبَ اللَّـهُ لَكُـمْ)، کـە ئـەم ئایەتە پیرۆزانە سەرجەمیان ئاماژەن، بۆ گۆڕانکاری و نەسخ ڕوودان، یاخود پێغەمبـەر ﷺ : ( كنت نهيـتكم عـن زيـارة العبـور، فزورهـا)، ڕێگـریم لێکردبـوون لـە سـەردانی گۆڕستان ، بەلآم لە مەودووا بیکەن ، رواه مسلم)، کەئەمیش بەڵگەیە لە سـەر ڕوودانـی نەسخ لە فەرموودەشدا، کە یەکەمجار نەهی کراوە، لە فەرموودەکـەدا، و دواتـر ڕێگـای پێداوە .

*ڕێگرییەکانی بەردەم ڕوودانی نەسخ:

١-نەسخ لە ڕوودانی هەواڵدان ( الاخبار )دا، ڕوونادات، چونکە ئـەم یاسـای نەسـخە زیاتر لە ئەحکامدا هەیـە ، وەلەلایـەنی تریـشەوەنەسخ لـە خەبـەر دا نیـشانەی ئەوەیـە کەخەبەرەپێــشووەکەناڕاست بــووە ، پەنابۆخواکەشــتی وا لــە پــەروەردگاریان پێغەمبەرەکەی ﷺ ڕووبدات، مەگەرلەکاتێکدا ئەو حوکمە لە شێوەی خەبـەردا هاتبێـت، ئەوە ئاساییە، کە ئەو خەبەرە نەسخ تیایدا ڕوبدات، چونکە لە ئەسڵدا، مەبەست پێـی حوکمەکە بووە، وەك خوای پەروەردگار دەفـەرموێت : (يَاأَيُّهَـا النَّبِـيُّ حَـرِّضْ الْمُـؤْمِنِينَ عَلَى الْقِتَالِ إِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ وَإِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ مِائَةٌ يَغْلِبُوا أَلْفًـا مِنْ الَّذِينَ كَفَرُوا بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لاَ يَفْقَهُونَ)، کە ئەمە خەبەرە ، کەچی بەئایەتی دوواتر (الان حفف الله عنكم) نەسخ کراوەتەوە، بەلآم مەبەست تیایدا حوکمەکەیە !

٢-ئەوحوکمانەی کەلەگشت سەردەمەکان و جێگاکاندا نەگۆڕێن و ئەوەناکرێت نەسخ تیایاندابکرێت ، وەك باسی یەکتاپەرستی ( تەوحید ) بنەماکانی باوەڕ ( أصول الایمان ) و بنەماکانی خوداپەرستی ( أصول العبادات ) ڕەوشت بەرزی ( مکارم الاخلاق ) وەی تریش یان لەکرداری خراپەوەك ( هاوەڵبڕیاردان بۆخودا :الشرك ) ( خراپەکاری ) وەهی تریش کەئەمانەلەچاکەوخراپە بۆهەمووسەردەمێکن و ناکرێت نەسخیان تیادائەنجام بدرێت .

*مەرجەکانی نەسخ:

١-هەرکات نەدەکراهەردوبەڵگەکەپێکەوەکۆبکرێنەوە و لە کاتی کۆ کردنەوە دا، دژایەتی لەنێوانیاندا درووست دەبوو لەوکاتانەدانەسخ درووستە ، تا بڕیارەکە بخرێت بە لایەکدا، وە هەر کاتێ کرا، پێکەوە کۆ بکرێنەوە، ئەو کاتە نەسخ درووست نی یە، تا بتوانرێت کار بە هەر دووکیان بکرێت.

٢-دەبێت بزانرێت کەسەرپارەکە دواترهاتووە و پێش سەرپاوەکە کەوتووە ،ئەوزانینەش لەڕێی دەقی قورئان هەوڵدانی صەحابە یان بەمێژوودەزانرێت ، نموونەی زانینی ئەو پاشکەوتنەی ( منسوخ )ـە، بە سەر ناسخەکەدا بە دەقی قورئان، وەك ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەرﷺکە دەفەرموێت: ( کنت أذنت لکم في الاستمتاع من النساء ، وأنّ الله قد حرَّم ذلك الی یوم القیامة ، رواه أحمد، ومسلم)، نموونەی زانینی پێشکەوتنی (ناسخ) بە سەر (منسوخ) دا بە هەوڵدانی صەحابی، وەك ئەو فەرمایشتەی دایکمان عایشەخان

کە دەفەرموێت : کە قورئان نازڵ بوو، یەکەم جار شیرپێدانی منداڵ ئەودوومنداڵەی لەیەکترحەلاڵ دەکرد بەڵام گۆڕدرابۆ ( ٥ ) جارشیرپێدانی ئاشکرا . نموونەی زانینی پێشکەوتنی ( ناسخ ) بەسەر ( منسوخ ) دا بەمێژوو وەك ئەوفەرمایشتەی پەروەردگاکەدەفەرموێت ( الان خفف الله عنکم ) کەفەرمایشتی ( الان ) ئەوەدەسەلمێنێت ،کەئەوحوکمەیان مێژووەکەی لەپاشترە ، یان بۆوێنە

کەپێغەمبەرپێش هیجرەت کارێکی کردبێت یان شتێکی فەرموبێت دووای هیجرەت پێچەوانەکەی بڕیاری داوە ئەوەی دووەمیان بەناسخ دێتەهەژمار .

٣-دەبێت ( ناسخ ) جێگیربێت و بەهێزتریش بێ لە ( منسوخ ) یاخودهاوو‌ێنەبن بۆیە ( ئاحاد ) ناتوانێت ( متواتر ) نەسخ بکاتەوە ، بەلآم لێرەدا ( الشیخ محمد بن صالح العثمین ) لەکتێبی ( الاصول من علم الاصول ) دا دەفەرموێت : کەمەرج نی یە ( ناسخ ) بەهێزتربێت لە ( منسوخ ) یان هاووشانی بێت ، چونکەنەسخ لەحوکمداڕوودەدات ، وەلەجێگیربوونی حوکمیشدا ( متواتر ) بوون بەمەرج نەگیراوە .

*بەشەکانی نەسخ:

یەکەم : ئەوەیە کە حوکمەکەی نەسخ کراوەتەوە بەلآم لەفزەکەی ماوەیە و ئەم جۆرە لە قورئانی پیرۆزدا وێنەی زۆرە، وەك هەر دوو ئایەتەکانی خۆڕاگرتن لە جیهاددا، کە دەفەرموێت: (إِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ عِشْرُونَ صَابِرُونَ يَغْلِبُوا مِائَتَيْنِ وَإِنْ يَكُنْ مِنْكُمْ مِائَةٌ يَغْلِبُوا أَلْفًا...)، کە بەئایەتی: (الآنَ خَفَّفَ اللَّهُ عَنكُمْ وَعَلِمَ ....) نەسخ کراوەتەوە، و مەبەستیش لە نەسخ حوکم و

مانەوەی لەفز هێشتنەوەی پاداشتە لەسەر خوێندنی ئایە تەکانی وفێرکردنی گەلی ئیسلامە بە بوونی نەسخ و ئەحکەمەکانی .

دووەم : ئەوەیە کەلە فزەکەی نەسخ بووەتەوە ، بەلآم حوکمەکەی ماوە ، وەك ئایەتی ڕەجم کردن (بەردباران ) کەلە هەردوو صەحیحی بوخاری موسلیمدا هاتووە، کە ئیبن عەباس دەگێڕێتەوە، پێشەوا عومەری کوڕی خەطاب، فەرمویەتی : لە سەردەمێکدا هەبوویە ئایەتی ڕەجم کردغان دەخوێندەوە، وفاسمان دەکرد کەمەبەستی چی یە؟ وپێغە مبەر * کاری پێدەکردو خەڵکی لەسەر بەردەبارانکرد، وئێمەیش لەدوای ئەو هەمان حوکمیان جێ بە جێ دەکرد،ئەترسم زەمان بێت بەسەرداو درێژببێتەوە ، خەڵکی بڵێن سوێندبەخوا ڕەجممان لەقورئاندانەدیوە ، خەلك بەم قسەیان گومڕابکەن ، وەیەکێك لەووشتانەی کەخوای گەورەفەرزی کردووە ئایەتی

لەسەردابەزاندووە ئیهمالی بکەن و جیّ بەجێی نەکەن ، بەلاّم بێگومان ڕەجم کردن لەقورئاندایەو هەرژن و پیاوێکی مێرد دار (پەنا بە خوا) زینایان کرد، بەردباران بکرێن، هەروەها ئافرەتیش شایەت و بەڵگەی درووستی لەسەربوو یان سکی پڕبوویان دانی بەتاوانەکەدا نا دەبێت سزای شەریعەتی بە سەردا جیّ بەجیّ بکرێت ، مەبەستیش لە نەسخی لەفزەکەو مانەوەی حوکمەکەی تاقیکردنەوەی گەلی ئیسلامە ، بەوەی کەبزانرێت کەحوکمێك لەقورئاندا بە لەفز نەهات و بەوجۆرەی کەبوو ، ئایا کاری پێدەکەن یان نا ! ! ئیمانەکەیان تاقی بکرێتەوە، بە پێچەوانەی جولەکەوە، کە هەوڵیان داوە، دەقەکانی ڕەجم کردن لە تەوراتدا بشارنەوە، و خۆیانی لیّ گێل بکەن!

سێیەم : ئەوەیە کە حوکمەکەی، و لەفزەکەشی نەسخ بووبێتەوە، وەك نەسخی (دە) جار شیرپێدان، وەك لە فەرموودەکەی (عایشة)خانی دایکماندا پێشتر باسمان کرد.

## ﴿ شێوازەکانی نەسخ ﴾:

یەکەم : نەسخی قورئان، بە قورئان، وەك ئایەتی خۆڕاگری لە جیهاد دا کە ڕابوورد.

دووەم : نەسخی قورئان بە سوننەت : لێرەدا شێخ محمد بن صالح العثیمین لە کتێبی ( الاصول من علم الاصول) دادەفەرموێت : نموونەیەکی ساغم بۆئەم دووەمینەدەست نەکەوت بەلاّم گومانی تێدا نی یە کەنەسخی قورئان بەسونەت ڕاجیای زنایانی زۆری لەسەرە .

سێیەم : نەسخی سوننەت بە قورئانی پیرۆز، لێرەدا (شێخ ابو الوفای موعتەمەدیی کانیمشکانی) لە کتێبی (اصول فقە امام شافعی)دا، نموونەیەکی هێناوەتەوە، بەم شێوازە، کە خوای گەورە دەفەرموێت: ( فول وجهك شطر المسجدالحرام – بقرة –١٤٤ ) فەرموودەکەی (کرداری: فیعلی) پێغەمبەرﷺنەسخ بووەتەوە، کە ڕووی کردۆتە کەعبە، و دەلێت، ئیمامی شافیعیش لە (الرسالة)دا، ئامارژەی بەم خالە کردووە، و دواتر (کانیمشکانی) بەردەوام دەبێت، لە سەر قسەکانی، و دەلێت، بەلاّم لە هەر جێگایەکدا قورئان بە سوننەت نەسخ بوو بێتەوە، ئەوا ئایەتێکی تر، ئەو نەسخکردنەی پالپشت کردووە، و دەشلێت نەسخی قورئان بە فەرموودە دروستە،

چونکە فەرمایشتی پێغەمبەریش هەر گوێڕیەلی کردنی پەروەردگار ، وەك لەقورئاندا دەفەرموێت : (إِنَّ الَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ اللَّهَ يَدُ اللَّهِ فَوْقَ أَيْدِيهِمْ فَمَنْ نَكَثَ فَإِنَّمَا يَنْكُثُ عَلَى نَفْسِهِ وَمَنْ أَوْفَى بِمَا عَاهَدَ عَلَيْهُ اللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا– الفتح / ١٠)، بەلاّم لەگەلّ ئەوەشدا ڕای تر هەن، بۆ نموونە، (ئیمام جلال الدین ی المحلی ) لە شەرحی (جمع الجوامع)دا، دەلێت: ( لا ینسخ کتاب الله، الا کتابه !!! ).

چوارەم : نەسخی سوننەت، بە سوننەت: وەك فەرموودەی پێغەمبەرﷺ، کە دەفەرموێت : ( كنت نهيتكم عن النبيذ في الاوعية، فاشربوا فيما شئتم، و لا تشربوا مسكراً، رواه ألامام أحمد).

## ﴿ هونەری نەسخ کردنەوە ﴾:

١- ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی مرۆڤەکان بەوەی کە چی زیاتر گرنگە، بۆیان و سودی زیاترە بۆیان، ئەوەیان وەك بڕیار بۆ دابنرێت.

٢- گەشە، و نەشوونماکردن لە دانانی شەریعەتدا، تا دەگاتە پلەی تەواو بوون، و کامڵ بوون.

٣-تاقیکردنەوەی مرۆڤەکان، ئەوانەی کە کەوتوونەتە ژێر بڕیاری شەریعەت تا بزانرێت، کە ئایا ئامادەییان هەیە، قبوولی گۆڕانکارییە شەرعیەکان، و بڕیارەکان بکەن، لە حاڵەتێکەوە، بۆ حاڵەتێکی تر، ئایا ڕازین بەو گۆڕانکا رییانە؟!

٤- تاقیکردنەوەی مرۆڤە مسوڵمانەکان، بەهەشتیان بە جێ بەجێ کردنی سوپاسگوزاری ڕاستەقینە بۆ زاتی پەروەردگار، ئەگەر نەسخ کردنەکە لە قورسییەوە بوو، بۆ ئاسانکاری، و بە جێهێنانی خۆڕاگرتن، ئەگەر حاڵەتی نەسخکردنەکە، لە ئاسانکارییەوە بوو، بۆ قورسی!

﴿ السنة ﴾

و سنة فــــعـــل النبیﷺقوله و هو قد احتجَّ، بـــــــه و فعله
اِن کان قربة و دلَّ باهـــــــر عـــــــلی اختصاصه به فظاهر
و الا علی وجوب او ندب حُمِل او یوقفَن هذا اختلاف قــــد نُقِل
او غـــیـــــر قربة مباح ظاهر و یوجب العلم لـــنــــا المتواتر
مــــــــن سنة، وغیره للعمل و لا احتجاجاً، عندنا بـــالمرسل
و استثن من هذا مراسیل سـعید ابـــــــن المسیب لاسناد مُفید
ثم الصحابی هــــــو المجتمع مصدقا بالمجتبی المــشــفـــع
و غیر شرط الروایة کــــــذا طول اجتماع تابعا کـــــذا خُذا

---

## دووەم : سوننەتی نەبەوی:

( السنة ) بەپلەی دووەم دێت، دووای قورئانی پیرۆز ، ئیش پێکردنی واجبەبەپێی قورئان و حەدیس وایجماع و عەقڵ مەگەر( حەدیسەکە ) ڕاست نەبێ .لەئایەتەکانی تەئکید دەکاتەوە لەسەرگوێڕیەڵی پێغەمبەر و شوێن کەوتنی . خوای گەورەدەفەرموێت : (یاأیها الذین امنوا أطیعوا الله واطیعوا الرسول و اولی الامر منکم فان تنازعتم في شيئ فردوه الی الله، والرسول .... النساء:٥٩)، لەم ئایەتەدا ئاماژە دراوە، بە چوار شت لە شەریعەتدا، اطیعوا الله ئاماژەیە بۆ الکتاب ، اطیعوا الرسول ئاماژەیە بۆ السنه ، اولی الامر ئاماژەیە بۆ الاجماع ، فردوه ئاماژەیە بۆقیاس ، ( سنة ) کەسەرچاوەی دووەمە دووای قورئان و هەروەها حوججەیە، لە سەر هەموو موسڵمانان بەدەلیلی کیتاب و ئیجماع و عەقڵ .

*دلیل الکتاب : ئەوئایەتەی سەرەوە ، هەرووەهاخوای گەورەدەفەرموێت: (وما اتاکم الرسول فخذوه، وما نهاکم عنه فانتهوه .. الحشر / ٧ ).

هەرووەهاخوای گەورەدەفەرموێت: ( وماينطق عن الهوى ان هـو الا وحـي يـوحى ، النجم / ٣ - ٤ ) .

*دليـل الاجمـاع : هەرلەسـەرەتای دەرکـەوتنی ئیسلامەوەتاوەکوئێـستا ئومـەتی ئیسلام کۆکن لەسەرئەوەی کە ( سنه ) حوجەیەو نابێ موخالەفەی لێ بکرێت، و دەبێ کاری پێبکرێت .

*دليـل العقـل : عـەقڵ، و ژیـری وا ڕینموونیمـان دەکـەن، کـە قورئـان پێویـستە ئەوکەسـە تەفـسیری بکـات، و شـەرحی بکـات کـەقورئان نێرراوەبـۆی یـان بـۆی هاتۆتەخوارەوە کەئەویش پێغەمبەرەﷺ، و دەبێ ئەوکەسەدەست پـاکبێ لەگەیانـدنی قورئاندا، هەروەك و چۆن بۆی هاتۆتەخوارەوە کەئەویش تەنهالەپێغەمبـەرداﷺ بـەدی دەکرێت .

پێناسەی سنة : لە لوغەتدا: ڕێگایەکی ڕاهـاتووە، جـا ئـەو ڕێگایـە پەسـەند بـێ، یـا ناپەسەند، وەك دەوترێت ڕێگای باوباپیران، (معتاد).

بەڵام پێناسەی فیقهیی (سنة) ئەوەیەکـەکارپێکردنی واجـب نـی یـە، بـەڵام توشـی پاداشت دەبێت ، بێ سـزادانی ئەوانـەی کەتـەرکی دەکـەن لـەم پێناسـەیەوە سـوننەت پێناسەکەی هاوشێوەیەلەگەڵ پێناسەی ( مندوب و مستحب و نافلة و تطوع ) .

پێناسەی ( سنة ) لای ئەهلی حەدیث : گێڕانەوەیە لەپێغەمبەرەوەﷺ لەووتەی یان کرداری یان صیفەتی یان سیرەتی یان هەڵوێستی .

پێناسەی ( سـنة ) لای زانایـانی ( أصـول ) بـریتی یـە لەوتـەو کـردارو تـەقریرەکانی پێغەمبـەرﷺ، ووتـەی پێغەمبـەر : ئەوەیەکەپێغەمبـەرﷺ فەرمویـەتی: وەك: ( أنمـا الاعمال بالنيات).

(فعـل النبـي)، کردارەکـانی پێغەمبـەرﷺ،وەکوشـێوەی نوێـژکردنی ، پێغەمبـەر ﷺ،دەفەرموێت ( صلوا کمـا رأیتمـونی اصـلی ... ) نوێژبکـەن وەك چـۆن نوێژدەکـەم .پێناسـەی تقریـر : ئەوەیەکەپێغەمبـەر ﷺ، ئینکـاری نـەکردووە بـەڵکوڕازی بـووەو

بەباشی زانیوە . بۆنموونە : پێغەمبەرﷺ، جارێکیان لەیەکێك لەغەزووەکاندا کە دەچن بۆ (بەنوقورەیضە) پێغەمبەرﷺ، دەفەرموێت: (لا یصلین أحدکم الا فی بنی قریظة ) واتە، نوێژ نەکەن، تا نەگەنە بەنوقورەیزە ... لێرەدا هەندێ لەصەحابیەکان واتێگەشتن کە کە پێغەمبەرﷺ، مەبەستی ئەوەبووە کەصەحابیەکان پەلەبکەن لەرۆشتندا بۆئەوەی کەزوو بگەنە بەنوقورەیزە ، بۆ ئەوەی نوێژەکەیان نەفەوتێ، بەلاّم هەندێکی تر لەصەحابەکان بەوە تێگەشتن کەپێغەمبەرﷺ، مەبەستی ئەوەیە کەنوێژ دوابخرێت، و هەر دەبێ لە (بەنوقورەیضە) نوێژبکرێت ، ئەم دوو ڕا جیاوازە، لای پێغەمبەرﷺ، باسکرا، بێدەنگ بوو، هەردوکیان ڕازی بوون بەمەدەڵێن تەقریر .. کەواتە سوننەتی پێغەمبەرﷺ، دابەش دەکرێ بەسێ بەشەوە :

یەکەم : السنة القولیة : ووتەی پێغەمبەرﷺ، وەك: (انما الاعمال بالنیات، و انما لکل امرئ ما نوی ........)، و ئەو ئەحکامانەی کە لە سوننەتی قەولیدا هاتووە، زۆربەی ئەحکامی تەفصلییە، هەروەها هەندێ ووتەی پێغەمبەر ﷺ، لە سەر شێوەی قەواعیدی شکڵی، وەك: ( لاضرر، و لا ضرار ).

دووەم : السنة الفعلیة : ئەمەش کرداری پێغەمبەرەﷺ، وەك: کورتکردنەوەی نوێژلەسەفەردا و ڕێزگرتنی میوان و ڕێزگرتن لەفەقیر و نموونەی پێشوو (صلوا کما رأیتمونی اصلی) اخرجه امام أحمد فی سنده ٣ / ٤٣٦.

سێیەم : السنة التقریریة : وەك ئەوەی کەتەقریری پێغەمبەر ﷺ، لە سەر (دادوەری: قضاء) موعازی کوڕی جەبەل کاتێك کەناردی بۆیەمەن یان ئەونموونەی پێشوو کەباسمان کرد .( لایصلین احدکم ألافی بني قریظة)، اخرجه امام أحمد فی باب الجهاد، کە گوتە و جۆرەکانی سوننەت بەگوێرەی چۆنیەتی دەرچوونی لەپێغەمبەرەوەﷺ، سێ جۆرە:

١-السنة القولیة . ٢- السنة الفعلیة . ٣- السنة التقریریة .

سوودی ئەم جۆرە دابەشکردنە بۆ ( باب تعارض و ترجیح ) لەنێوان دەلیلە شەرعیەکاندا هەروەکو زاناکان دەڵێن ووتە ( قول ) بەهێزترە لە ( فعل ) ، هەرووەها (

فعل ) یش بەهێزترە لە ( تقریر ) ، هەروەها دابەشکردنی سوننەت بەگوێرەی سەنەدەکەی دەکرێ بە دوو بەشەوە :

١ ) حدیث متصل :

أ – حدیث متواتر . ب – حدیث أحاد

٢ ) حدیث غیر متصل ( منقطع ) :

أ – المرسل . ب – المعضل .

١ ) الحدیث المتصل : بریتییە لەوفەرموودانەی کەسەنەدەکەی دەگاتەوە پێغەمبەرﷺ، بەبێ پچڕان .

٢ ) الحدیث المنقطع : بریتیە لە فەرمودانەی کەسەنەدەکەی پچڕانی تێدەکەوێت، تا دەگاتەوە پێغەمبەر ﷺ، جائەو پچڕانە لەسەرەتای زنجیرەی سەنەدەکە بێ، یان ناوەڕاست یان لەکۆتایی .

حدیث متصل : لای جمهوری زانایان دوجۆرە :حدیث متواتر ( کۆمەڵێك)، حدیث الاحاد ( یەك کەس ) .

لای حەنەفیەکان سێ جۆرە :المتواتر ( ژمارەیەکی زۆر) . المشهور (چەندکەسێك ) . الاحاد ( یەك کەس ) .

لای ئیمامی سیوطی چوارجۆرە :المتواتر ژمارەیەکی زۆر . المشهورسێ کەس . العزیزدووکەس . الاحایەك کەس .

زانستی سوننەت پێك دێت لەدوبەشی سەرەکی :

١ ) بەشێکیان پەیوەستەبەسەنەدەوە پێی دەوترێت، زانستی گێڕانەوەی حەدیس مەوزوعی ڕیوایە لێکۆلینەوەیەلە ( أحوال و صفات)، تاوەکو دەگاتە ئامانج، واتە، تەئکیدکردنەوەلەنەپچڕاندنی سەنەدەکە، بە پێغەمبەر ﷺ، واتە: هەر کاتێ سەنەدەکە، گەیشتە پێغەمبەرﷺ، بە بێ پچڕان و بەو مەرجە گونجاوانەی کە دانراوە، لە لایەن زاناکانەوە، ئەو کاتە بەو سەنەدە دەگوترێت:( السندالصحیح ) .

٢) بەشەکەی تریان پەیوەندی بەمەتنەوە هەیە، واتە، بە دەقی فەرموودەکەوە، و پێی دەگوترێت زانستی ( درایە) مەوزوعی ( متن الحدیث) بریتی یە، لە زانینی دەقی فەرموودەکە کەئامانجەکانی و مەبەستی پێغەمبەرﷺ، لەوتەکانی، وفیعلەکانی، و تەقریرەکانی.

الحدیث المتواتر: بریتییە لە گێرانەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ، لە لایەن کۆمەڵێکی زۆرلەسەحابەکان بەمەرجێ ( مستحل ) بێ بەپێی عەقڵ و عادەت کەنەك کۆمەڵێك رێك بکەون لەسەردرۆ پێویستەلەمانیشەوەکۆمەڵێکی زۆر ترفەرمودەکانی گێڕابێتەوە و لەمانیشەوەکۆمەڵێکی ترتادەگاتە سەردەمی نووسینەوەی حەدیس واتەدەبێ هەموو ( طبقة ) کان ژمارەیان زۆربێ .

**مەرجەکان:** پێویستەئەم مەرجانە لە فەرموودەی موتەواتیردا هەبێت :

١. پێویستەجیلی یەکەم راستەوخۆفەرمودەکەیان لەپێغەمبەر ﷺ، وەرگرتبێ جابەبینین بێ یان بیستن .

٢. پێویستە لای عەقڵ موستەحیل بێت، کە ئەم کۆمەڵانە رێك کەوتبن، لە سەر درۆ!

٣. پێویستە مەرجی دووەم دوبارە بێت، لە هەموو طەبەقەکاندا کە دەیگێڕنەوە.

طەبەقەکانیش: ( صحابە ، تابعین ، تابعی تابعین ) .

صحابة : ئەوکەسانەن کەپێغەمبەریانﷺ، بینیوەو باوەڕییان پێی بووە .

تابعین : ئەو کەسانەن کە ( صەحابەیان ) بینیوەو باوەڕییان پێی هەبووە .

تابعی تابعین: ئەو کەسانەن کە (تابعین)یان بینیوە، و باوەڕییان پێی هەبووە

**جۆرەکانی حە دیثی متواتر :**

١ ) المتواتر اللفظی : ئەو جۆرەیە، کە یەك جۆر لەفز(لفظ)ی، هەیە، لە هەموو رێگاکانەوە، نموونەزۆرە، لە فەرموودە فیعلییەکانەوە، بەڵام زۆرکەمە لەفەرموودە قەولیەکانەوە ، نموونە ( لاتکتبوا عنی ومن کتب عنی شیئا غیر

القرأن فليمحه)، یان (حدثوا عنی، و لا حرج)، یان (ومن كذب علي معتمدا فليتبوا مقعده من النار)، ئەم فەرموودەیە زیاتر لە ﴿سەد﴾، صەحابە گێڕاویانەتەوە!

٢. المتواتر المعنوی : ئەوجۆرەفەرمودانەیەكە كەماناكانی گێڕاوەتەوەبە (الفاظ)، و دەستەواژەی جیاواز ، بەلآم هەموویان یەك مانایان هەیە ، بۆنموونە فەرموودەی (انما الاعمال بالنيات..)، ئەم فەرموودەیە گێڕاو یا نە تەوە، بە چەندەها ( الفاظ ) و دەستەواژەی جیاواز ، بەلآم هەمویان یەك مانایان هەیە.

<u>بایەخی الحديث المتواتر :</u>

فەرموودەی موتەواتیر دەمانگەیەنەتە زانستێكی بێگومان، و سەد لە سەد، (علما قطعی)، واتە: (يقين)، و پێویستە كاری پێ بكرێت، چونكە ثابت بووە، و لە لایەن پێغەمبەری خواوەﷺ، گوتراوە، هەروەها ( قطعی ثبوت)ـە، وەكو قورئان.

فەرموودەی موتەواتیر، دەلالەتەكەی (قطعی)یە، ئەگەر هاتوو زیاتر لە یەك مانای هەڵنەگرت، وە (ظنی)یە، ئەگەر هاتوو زیاتر لە یەك مانای هەڵگرت.

لە یەكەمیاندا دەلالەتی (قطعی)، زانایان دەفەرموون، هەر كەسێك باوەڕی بەو فەرموودە موتەواتیرە نەبێت، كە (قطعی)یە، لە دەلالەتا، ئەوا كافر دەبێت!

<u>(حديث الاحاد: فەرموودە ئاحاد):</u> خەبەرێكی تاكە بەپێچەوانەی موتەواتیر:

<u>پێناسەكەی:</u> بریتی یە لەوفەرمودەیەی كەلەگێڕانەوەكەیدا لە هەموو طەبەقە یەكدا كەسێك، یان دووان هەیە، و سەنەدەكەی دەگاتەوە بە پێغەمبەرﷺ، وە زۆربەی فەرموودەكانی پێغەمبەرﷺ، لەم جۆرەیە، بە گوێرەی ڕەئی جمهور، (حدیث)ـی، مەشهوریش دەكرێتە فەرموودە ئاحاد .

<u>* ئەنجامەكانی ئەم پێناسەیە:</u>

١ . فەرموودەی ئاحاد، مەرجەكانی فەرموودەی موتەواتیری تێدا نییە.

٢ . پێویستە سەنەدەكەی بگاتەوە، بە پێغەمبەرﷺ.

حوکمەکەی: پێویستە کاری پێ بکرێت، لـە بـەر ئـەوەی کـە ڕای زۆرینـە وایـە، مەگەر دەلیلێکی تر هەبێت، و بەهێزتر بێت، و پێچەوانەی ئەم بێت.

بنەمای شەرعیی، و ژیریی کارکردن، بە فەرموودەی ئاحاد:

یەکەم : بنەمای شەرعی :

أ : لەقورئانی پیرۆزدا : خوای گەورە دەفەرموێت: ( يأيها الذين امنـوا ان جـائكم فاسـق، بنبا فتبينوا ....)، ئەم ئایەتە ئاشکرایە، مەفهومەکەی ئەوەیە، کە ئەگەر کەسێك عادل بێـت، خەبەرەکـەی قـەبوول دەکرێـت، هـەروەها شایەتییەکەشـی، ئـیتر پێویـست بـەوە ناکـات، لێکۆڵینەوەی لـەگەڵدا بکرێت، خودای گەورە دەفەرموێت: ( فلولا نفر من كل فرقة مـنهم، طائفة، ليتفقهوا في الدين، و لينذروا قومهم اذا رجعوا اليهم، لعلهم يحـذرون)، لـەم ئایەتـەوە بۆمان دەردەکەوێت کە خوای گەورە، هانی مـسوڵمانان دەدات، کـە لـە هـەر کۆمـەڵێکی زۆر، چەند کەسێك، شارەزا بن،لە دین، بـۆ ئـەوەی کـە گەڕانـەوە ئاگـاداری هۆزەکانیـان بکەن، لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت، خەبەری ئاحاد حوججەیـە، ئەگـەر وا نەبووایـە، خـوای گەورە ئاوا ئاماژەی پێ نەدەکرد.

ب: لـەسیرەی پێغەمبەران بەگشتیی: نـاردنی پێغەمبـەران بـۆ سـەر گەلـەکانیان ئەساسـی وەرگرتنی خەبەری تاك بووە، واتە، بە تەنها نێردراون، و هیچ کەس ڕەخنەی ئەوەی نەبووە، کە بڵێت، مادام پێغەمبەران، بە تەنها نێردراون، ئەوا خەبەریان لێوەرناگیرێت!

ج: لـە سیرەی پێغەمبەران : دەبینین کەپێغەمبەرﷺ، بـەتاك صـەحابەی دەنـارد، بـۆ هۆز، و تیرە جیاوازەکان، ئەگەر بهاتایە خەبەری تاك (حجة: بەڵگـە)، نەبووایـە، ئـەوا پێغەمبەرﷺ، نەیدەناردن.

دووەم: بنەمای لۆجیکی : لۆجیکی مرۆڤ، و بـیری سـاغ، هـەردووکیان دان دەنـێن، بـە حوججیەتی خەبەری تاکدا، و زەرورەتی وەرگرتن و ئـیش پێکردنـی، هـەرووەها گونجانـدنی لـەگەڵ فیترەتی مرۆڤدا، و وەرگرتنی فەرموودەی ئاحاد نەمەحاڵە، و نـە فەسـادیش دروسـت دەکات، لە کاتی وەرگرتنیدا.

خەبەری تاك بەڵگەیە، بەم مەرجانەی کە زاناکان باسیان کردووە :

یەکەم: مەرجەکانی حەنەفییەکان بەم شێوەیە :

١. نابێت ئەوکەسەی کە فەرموودەیەکی گێڕاوەتەوە، بە پێچەوانەی ئەو فەرموودەیە کاری کردبێت.

٢. نابێت، بابەتی خەبەرەکە، لەو بابەتە هەمیشەییانەی ژیانی ڕۆژانە بێت.

٣. نابێت، پێچەوانەی قاعیدەیەکی گشتیی، یان پێوەرێکی ڕاست بێت.

٤. نابێت، دژ بێت، لە گەڵ بەڵگەیەك کە لە خۆی بەهێزتر بێت، وەك: (قورئان، سوننەتی موتەواتیر، و ئیجماع، و قیاس).

*مەرجی یەکەم : ان لا یعمل الراوی، بخلاف ما رواه:

نابێت ڕاوی کار بکات، بە پێچەوانەی ئەوەی کە گێڕابێتییەوە، چونکە ئیمام ئەبوحەنیفە ڕای وایە، کە ئەگەر کەسێك، فەرموودەیێك ڕیوایەت بکات، کە خۆی پێشتر بێت، لە هەموو کەسێك، کە کاری پێبکات، ئەگەر کاری پێنەکرد، کەواتە فەرموودەکە درووست نییە، بۆیە ئیمام ئەبوحەنیفە، ڕەتی ئەم فەرموودە دەکاتەوە، کە لە دایکی مسوڵمانان عائیشەوە، گێڕاویەتیەوە،

لە پێغەمبەرەوەﷺ، کە دەفەرموێت: (ایما أمرأة نکحت بغیر اذن ولیها فنکاحها باطل)، هەر ئافرەتێك شوو بکات، بە بێ ڕەزامەندیی وەلی ئەمرەکەی، ئەو نیکاحە بەتاڵە، حەنەفییەکان ئەم فەرموودەیە ڕەت دەکەنەوە چونکە دەڵێن، دایکی مسوڵمانان خۆی برازایەکی خۆی بە شوودا، بە بێ ڕەزامەندیی وەلی ئەمرەکەی، کە برای خۆی بوو، و براکەی لەو کاتەدا لە شام بوو!

*مەرجی دووەم : ان لا یکون موضوع خبر مما تعم البلوی:

نابێ بابەتەکە، لەو حوکمانەی بێت، کە ڕۆژانە دووبارە دەبنەوە، لە نێوان خەڵکیدا، بۆ نموونە کاتێك کە دەگوترێ خوێندنەوەی فاتیحە لە نوێژدا واجبە، (لا صلاة لمن لم یقرأ بفاتحة الکتاب)، ئەم فەرموودەیە یەك کەس گێڕاویەتییەوە، لە گەڵ ئەوەشدا کە واجب بوو، صەحابەیەکی زۆر بیانگێڕایەتەوە، چوونکە هەموو نوێژێك

ژمارەیەکی زۆر لــە گــەڵ پێغەمبــەرداﷺ، نوێــژیان کــردووە، بــەڵام کەســی تــر لــەو صەحابانە، ئەم فەرموودەیەیان نەگێڕاوەتەوە، بۆیە کاری پێناکرێت!

*مەرجی سێیەم : ان لا یکون مخالفا، للقاعدة الکلیة:

چوونکە لای ئیمام ئەبوحەنیفە، قاعیدەی گشتیی لە پێش (خەبەری ئاحاد) ــەوەیە، و لە بەر ئەوەیشە، ئیمام ئەبوحەنیفە ڕەتی ئەو فەرموودەیە دەکــات، کــە ﴿فــاطیمــەی کچی قەیس﴾ ڕیوایەتی کــردووە، دەفــەرموێت: پێغەمبــەر ﷺ، بڕاندویەتییــەوە، کــە ئەگەر ئافرەتێك تەڵاقدرا، نەفەقــە، و ســوکنای بــۆ نــاکرێ، بــەڵام ئــەم فەرموودەیــە، پێچەوانەی قاعیدە گشتییە جێگیرەکەیە، کە دەڵێت، ئەگەر ژنێــك تەڵاقــدرا، پێویــستە نەفەقە، و سوکنای بدرێتی، مادەم لە

عیددەدایە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێت:(أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُمْ مِنْ وُجْدِكُمْ وَلاَ تُضَارُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا عَلَيْهِنَّ وَإِنْ كُنَّ أُولاَتِ حَمْلٍ فَأَنْفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّى يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَأْتَمِرُوا بَيْنَكُمْ بِمَعْرُوفٍ وَإِنْ تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُ أُخْرَى) (١٢).

*مەرجی چوارەم : ان لا یعارض، بدلیل اقوی:

نابێ دژ بێ، لەگەڵ بەڵگەیەك، کە لە خۆی بەهێزتر بێت، چــونکە هەریــەك لــە قورئــانی پیرۆز، و سوونەتی موتەواتیر، و ئیجماع، و قیاس، بەهێزترن، لە خەبــەری ئاحــاد، لــە بــەر ئەوەیە، ڕەتی فەرموودەی (المصراة)ــی داوەتەوە، چــونکە بــە تێڕوانینــی ئــەو، دژە لــە گــەڵ قورئان، و سوونەت، و ئیجماع، و قیاس.

*فەرموودەکە:*

(لا تصروا الابل، و الغنم، فمن ابتاعها بعد ذلــك فهــو بخــیر النظــرین، بعــد یحلبهــا، ان رضــیها امــسکها، و ان ســخطها ردّهــا، و صــاعا مــن تمــر)، گــوانی حوشــتر، و مــەڕ مەبەســتن، چــونکە ئەگەرکەسێك بەگوان بەستراوی، فرۆشتی، ئەوکاتە کەسی کڕیار، کە شــیرەکە بــەکار دێنــێ، لــە نێوان دوو ئیختییاردایــە، یــان ڕازی دەکــات، و قــەبووڵی دەکــات، یــان ڕەفــزی دەکــات، دەبــێ

١٢. سورة الطلاق، ٦.

حەیوانەکە بگەڕێنێتەوە، لە گەڵ (صاعێك) لە خورما، ئیمامی ئەبوحەنیفە کاری بەم فەرموودەیە نەکردووە، چونکە:

١. پێچەوانەی قورئانە، خوای گەورە دەفەرموێت: (فَمَنْ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ) (١٣)، هەر کەسێ دەستدرێژی لێکردن، ئەوا لێی بکەنەوە، بە قەدەر ئەو دەستدرێژییەی کە لێتانکراوە.

٢. پێچەوانەیە، لەگەڵ ئەو فەرموودە مەشهورەی کە دەفەرموێت: (من اعتق شقصا، له في عبد، قوم عليه نصب شريكه، اذا كان موسرا)، هەرکەسێ گەردنی بەندەیەك ئازاد بکات، لە بەشەکەی خۆی، لە پێشترە بەکڕینەوەی بەشی شەریکییەکەی، ئەگەر توانای هەبوو، ئەم فەرموودەیە ئەوە دەگەیەنێت، کە ئەو شیرە بە قەد (صاعە) خورماکە، چۆن دیاریکرا، کێ دەڵێ زیاتر نییە، یان کەمتر، هەروەها پێچەوانەی ئەوفەرموودە مەشهورەیە، کە دەفەرموێت: (الخراج بالضمان)، بە گوێرەی ئەم قاعیدەیە، ئەم شیرە موستەحەققی موشتەریە، بۆی نییە، کە هیچ بە موقابیلی ئەو شیرە بگەڕێنێتەوە!

٣. بە پێچەوانەی (ئیجماع)ـە، چونکە ئیجماع دەڵێت، ضەمانی میثلی بە میثلە، و ضەمانی قیمی، بە قیمەتەکەیەتی، واتە، هەرشتێك میثلی بوو، پێویستە نموونەیەکی وەکو خۆی بۆبهێنیتەوە، وئەگەر قیەمی بوو، پێویستە قیمەتەکەی بۆ دابین بکات.

واتە، ئەگەر هاتوو، شیرە فەوتاوە،کە میثلی بوو، پێویستە هەر شیری بۆ بگێڕیتە وە، بۆچی خورما؟!

ئەگەر هاتوو، شیرە فەوتاوەکە، قیمی بوو، ئەوا پێویستە نرخی شیرەکە، دیاری بکرێت، بە پارە، و پارەی بۆ بگێڕیتەوە، نەك خورما.

٤. بە پێچەوانەی قیاسە، لەم ڕووانەوە:

یەکەم: القياس الكلی لە ضەماندا، هەر شتێ میثلی بوو، ئەبێ ضەمان بکرێ، بە میثل، وئەگەر قیمی بوو، ضەمان دەکرێ، بە قیمەتەکەی.

---

١٣. سورة البقرة، ١٩٤.

دووەم : لە قیمەتدا نرخ زیاد، و کەم دەکات، بە گوێرەی ئەندازەی شتە لەناوچووەکە، چۆن ئەبێ، صاعی خورماکە بکرێ، بە قیمەتی شیرە فەوتاوەکە.

سێیەم: ئەوشیرە، فەوتاوە، لەوانەیە هەندێکی لە کاتی بەستنی عەقدەکەدا، دروست بێت، و هەندێکی تریشی دوای بەستنی عەقدەکە، لەم کاتەدا هەندێکی ضەمان ناکرێت، چونکە کەس نییە، ئەو شیرە لێك جیا بکاتەوە، بۆ ئەو دوو کاتە جیاوازە.

چوارەم: شەرع دەفەرموێ، گێڕانەوەی شتێك، واتە، (پەشیمان بوونەوە)، دەبێت، ئەو شیرە عەیبێکی هەبێت، یان مەرجێك هەبووبێ، بۆ گێڕانەوەی، بەڵام ئەو خورمایە، نە عەیبێکی هەبوو، نە مەرجێك، تا بیگەڕێنێتەوە.

*- توێژینەوەی ڕای حەنەفیەکان:*

سەرجەم ئەو بەڵگانەی کە حەنەفییەکان هێناوییانە، بۆ کار نەکردن، بەم فەرموودەیە، دامەزراوە، لە سەر بنەمایەکی (خەیاڵی: موهوم)، ئەوان وا دادەنێن، کە ئەو (صاع)ـە، خورمایە، قەرەبوویە، بۆ ئەو شیرەی کە فەوتاوە، بەڵام وانییە، بەڵکوگەڕانەوەی ئەو صاعە خورمایە، موقابیلی (معاملة بالحسنى: بلاوبوونەوەی ئەدەبە)، خوای گەورە دەفەرموێت: ( اِدفع بالتي هي اَحسن)، و ئەم کردارە خۆی لە خۆیدا، فێڵ و هەڵخەڵەتاندنە، و هەر مەعامەلەیەك فێڵ و تەڵەکەی تیاداکرا، ئەوا فرۆشیاردەتوانێ بیگەڕێنێتەوە، بە بێ ئەوەی ضەمان بچێتە سەری، هەروەك چۆن کاتێ ئیسپاتی فێڵ کرا، کڕیار بۆی هەیە، عەقد هەڵبوەشێنێتەوە، بە بێ ئەوەی قەرەبوو، بچێتە سەر شانی، هەروەها ئەو عەقدە، وەستاوە، لە سەر ڕەزامەندی موشتەری، بۆیە فەرموودەی (المصراة)، خۆی لە خۆیدا، ئەصڵێکی ئوصوڵی شەرعییە، و جیاوازە، لە گەڵ قاعیدەی تردا، و ئەوەی لێرەدا باسکراوە، جیاوازە، لە فەرموودەی (الخراج بالضمان)، لە بەر ئەوە، ئەم فەرموودەیە، خۆی ئەصڵە، و ئەصڵیش لە قیاسەوەیە.

دووەم: مەرجەکانی "مالکییەکان"، بۆکارکردن، بە خەبەری ئاحاد، و قەبووڵکردنی :

**١. نابێ خەبەری ئاحاد، پێچەوانەی کاری ئەهلی مەدینە بێت، چونکە ئەهلی مەدینە:**

أ: شارەزاترن، لە سوننەت، لە کەسانی تر.

ب: وەرگرتنی فـەرموودەکانی پێغەمبـەرﷺ، لـە مەدینـەدا، جیـل لـە دوای جیـل بـووە، بـە شێوەیەك، کە پچڕانی تێ نەکەوتووە، و ئەهلی مەدینە،کارکردنیان بە فەرموودەی پێغەمبەرﷺ، لـە پێش خەڵکی ترەوە بووە!

ئەگەر هاتوو، خەبەرێکی ئاحاد پێچەوانەی ئەهلی مەدینە بوو، ئەوا ئـەو فەرموودەیـە لاوازە، و عیللـەت لـەو فەرمودەیەدا، دەبینیرێت، بە ڕای مالکی یەکان، هەروەها بە ڕای ئەوان ئەهلی مەدینە شارەزاترن، لـەکەسانی تر.

لە بەرئەوەیشە،کە کار ناکەن، بەو فەرموودەیەی ﴿ئیبن عومەر﴾، ڕیوایەتی کردووە، لە بارەی (خیاری مجلس)، کە دەڵێت: ئەم فەرموودەیە موخالیفە بەکاری ئەهلی مەدینە، و فەرموودەکـەیش ئەمەیە:

﴿المتبایعان بالخیار، ما لم یتفرقا، الی ثلاثه أیام﴾.

* ***هەڵسەنگاندنی ڕای مالکییەکان:***

١. مەرج نییە، زانستی (سوننە)، کۆبکرێتەوە، تەنها لـەو کەسـانەدا، کـە تـەنها لـە مەدینـەدا ژیاوون، چونکە لـە مێـژووی ئیـسلامدا، زۆرێـك لـە هـاوەڵان لـە دەرەوەی مەدینـە ژیـاوون، و نەشگەڕاونەتەوە، بۆ شاری مەدینە، و هەر یەك لەو صەحابانە، بەشێك لەو زانستەی پێ بـووە، جـا زۆر بێت، یان کەم.

٢. بە نیسبەت (خیاری مجلس)، کە دەڵێـت: ئیجمـاعی ئـەهلی مەدینـە وا بـووە، کـە کـاری پێنەکەن، وانییە! چونکە ئەوەتا دەبینرێ، لەکۆندا ﴿ئیبن عومەر﴾، ئەهلی مەدینەیەکاری پێکردووە، پاشانیش لە دوای ئەو (ئیبن ئەبی ذئب)یش، هەرکاری پێکردووە.

سێیەم: مەرجەکانی شافیعییەکان، و حەنبەلییەکان:

شەرعزانەکانی (فقهاء)ـی، شافیعیی، وحەنبەلـییەکان، هیچ مەرجێکیان دانەنابوو، بـۆ کارکردن بە (حدیث أحاد)، جگە لە ڕاستی سەنەدەکەی، و پەیوەندیی بە پێغەمبەرەوە، ﷺ، ئەگەر هاتوو، سەنەدەکەی صەحیح بوو، ئیتیصالی هـەبێت، بـە پێغەمبـەرەوەﷺ، ئەوا واجبە،کاری پێ بکرێت.

چوارەم: مەرجەکانی ظاهیرییەکان، "فوقەهاکانی ظاهیرییەکان":

هاوڕان لەگەڵ شافیعییەکان، و حەنابیلەکان بۆ کارکردن، بە خەبەری ئاحاد، بەڵکو لەوانیش زیاتردەڵێن، کارکردن بە خەبەری ئاحاد واجبە، بەلاّم شافیعییەکان، و حەنبەلییەکان، دەڵێن لە بابی ئیحتیاتدایە.

پێنجەم: مەرجەکانی شیعەی ئیمامی :

یەکەم: شیعەکان پێچەوانەی جمهوری عولەما، پێناسەی (السنة)یان کردووە، چونکە جمهور پێناسەی (السنة) قەولی نەبیّ، و فیعلی، و تەقریریی ئەوە، بەلاّم لای شیعەکان بریتییە، لە ( قول المعصوم، وفعله، و تقريره).

دووەم: کارکردن بە خەبەری ئاحاد، لای شیعە، پێویستە ئەم دوو مەرجانەی تێدا بێت:

أ: پێویستە ئەوکەسانەی فەرموودەکەیان گێڕاوەتەوە، دووان بن.

ب: نابیّ پێچەوانە بێت، لەگەڵ مەزهەبی ئەهلی و بەیتدا!!

لەبەر ئەمەیشە، کە کار ناکەن، بە زۆربەی فەرموودە، ئاحادەکان، و لەناویشیاندا ئەو فەرموودانەی زەواجی موتعەی حەرام کردووە، (الزواج المؤقت).

## ڕۆڵی سوننەت لەیاسای ئیسلامدا :

(السنە)، لە شەریعەتی ئیسلامدا، بە سەرچاوەی دووەم دێت، دوای قورئانی پیرۆز، پەیوەندی (السنە)، بە قورئانەوە، وەکو پەیوەندی، ئەو یاسا، و تەشریعانە وایە، بە دەستووری ولاَتێکەوە، ئاشکرایە کە دەستور، لە وولاَتێکدا ناچێتە ناو جوزئیاتی ڕوداوە تایبەتەکانەوە،کە باس لە هێڵە گشتییەکان دەکات، لە ژیانی سیاسیی، و ئابوریی، و کۆمەلاَیەتیی، و هەر شتێکی تر،کە پەیوەندی هەبێ، بە کۆمەڵگا، و دەوڵەتەوە، بەلاَم (تەشریعات، و یاسا، و پرۆگرام، و لەوائیح)، دەچنە ناو وردەکاری، و دانەدانەی ئەو ڕووداوانەی کە پێویستیان بە تەفصیلات هەیە، بەو شێوەیە قورئان باس لەو مەبادیئە گشتییانە دەکات، و (السنة)، هەڵدەستێ بەڕوونکردنەوە، و ئاشکراکردنی مەبەست، و جێبەجێکردنی لەژیانی ڕۆژانەدا ، هەروەها (السنة)، سەرچاوەکەی لە خوداوەیە، وەك، خودای گەورەدەفەرموێت: (وَمَا يَنطِقُ عَنْ الْهَوَى(٣)إِنْ هُوَ إِلاَّ وَحْيٌ يُوحَى(٤)– النجم)، وە هەروەکو قورئانە، بۆیە شان بەشانی قورئان دەڕوات، بە بێ کاریگەری کات، و زەمان، واتە، بۆ هەموو سەردەم، و شوێنێك گونجاوە.

لەبەر ئەوەیشە، ئوصولییەکان، هەندێ پەیوەندییان داناوە، لە نێوان قورئان و سوننەتی پێغەمبەردا،ﷺ، ئەو پەیوەندییانەیش لەم خالاَنەی خوارەوەدا دەبینرێن:

١ – تخصيص عمومات القران: تایبەتکردنی دەقە گشتییەکانی قورئان.

٢ – تقييد مطلقات القران: بەستنەوەی دەقە ڕەهاکانی قورئان.

٣ – ايضاح مجملات القران: ڕوونکردنەوەی دەقە تێکڕاکانی قورئان.

٤ – تأكيد أحكام القران: جەختکردنەوەی یاساکانی قورئان.

٥ – الاستقلال بوضع أحكام، لا توجد في القران صراحة: سەربەخۆبوون، لە دانانی یاسا گەلێك، کە بەڕاشکاوی لە قورئاندا نەهاتوون[١٤].

---

١٤ بنەماکانی فیقهی ئیسلامیی، دکتۆر صەباح بەرزنجی، چاپی دووەم، سلێمانی ٢٠٠٨.

### ﴿ الاجماع ﴾

هـــــو اتفاق فقهاء العصر ... بعد وفاة المصطفى فـــــى أمر
و هو لـديهم حجة في الدهر ... و غير شـــــرط انقراض فأَدرِ
بقول، أو فعل من الكل يقع ... أو بعضهم و غيره لـــــه خضع
و قول واحد، غدا ذا صحبة ... على الجديد ليس هـــــو بحجَّةٍ
و كفَّروا منكر مُجمَعٍ عـليه ... من ديننا، و هـــــو قد اضطرَّ اِليهِ
ذا مطلق اِن كان فيه نــص ... أَوْلا على الاصح لـــــم يغصّوُا

---

## سێیەم: (الاجماع: یەك دەنگی: كۆڕا ):

ئیجماع: بـه سـێیەم سەرچاوەی تەشـریع و بڕیـاردان دەژمێردرێـت لەئیـسلامدا، سەرەتاکەشـی لەوکاتەوەدەسـتی پێکـردووە کەپێغەمبـەر ﷺ، کۆچـی دوایـی کـرد ، ئەوەبوو، هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ، تووشی چەندین ڕووداوی نوێ دەبوونەوە، جا ئەگـەر لـــە قورئـــان و ســـوننەتدا، بـــەدییان بکردایـــە، ئـــەوا بڕیاریـــان لێـــوەدەدا گەرلەودووسەرچاوەشەوەیە، بەدییان نەکردایە لە ڕێی ڕاوێژ، و پـرس، و ڕاوە بڕیاریـان لێیەوە، دەدا.

<u>پێناسەکەی:</u>

١ – لەزمانەوانیدا : بریتی یەلە یەکدەنگییەکی پێشوەخت ویەك هەڵوێستە لـە سـەر کارێ لەکارەکان. (في اللغة: هو "العزم، والاتفاق"، )!

أ – خوای گەورەدەفەرموێ : ( فأجمِعوا أمرَكم – يونس :٧١ ) أي: اعزموا عليه.

له فەرمودەیەکی پێغەمبەرﷺدا: (لا صـيام لمـن لم يجمـع الـصيام مـن الليـل، أي: لم يعزم، ولم ينو في الليل الصيام) .

ب – يقال اجمع القوم على كذا، أي: اتفقوا عليه.

٢. وفي اصطلاح أهل الشرع: لە زاراوەشدا بریتییە، لە ( یەکدەنگی و ڕێککەوتنی موجتەهیدەکانی ئوممەت لەپاش وەفاتی پێغەمبەرﷺ، لە سەردەمێك لە سەردەمەکان، لە سەر بڕیار، و حوکمێکی شەرعیی کە ڕێگەی ئیجتیهادی تێدا بێت، لە ڕووداوێك لە ڕووداوەکان، بە پشت بەستن بە سەنەدی شەرعیی لەقورئان و سوننەت ! ).

* دەرەنجامەکانی پێناسەی ئیجماع:

١. یەکدەنگیی هەموو موجتەهیدەکان لە سەر بڕیارەکە پێویستە، و بۆیە گەر هەندێ لە موجتەهیدەکان موخالەفە، و پێچەوانەیان کرد، ئیجماع نایەتەدی.

٢ – پێویستەموجتەهیدەکان لەئوممەتی پێغەمبەرﷺبن.

٣ – پێویستەئیجماعی موجتەهیدەکان (صریح)، ڕاشکاو یان (ضمنا) بێ .

٤ – پێویستە (الاجماع)، لەپاش وەفاتی پێغەمبەرﷺبێت، چونکە (الاجماع)، لە ژیانی پێغەمبەرداﷺدەوری نییە.

٥ – پێویستە بابەتی ئیجماعەکە لە (الاحکام الشرعیة الاجتهادیة) بێت، و لە (احکام قطعي ثابت) نەبێت !

٦ – پێویستە ئیتفاقی موجتەهیدەکان پاڵپشت بێت بەسەنەدی شەرعیی لەقورئان و سوننەت،(الکتاب، والسنة).

* هەندێ سەرنج، و تێبینی:

١ – ژمارەیەکی دیاریکراو، دیاری نەکراوە، بۆ بەدیهاتنی ئیجماع، ( بۆیە بە کەمترین ژمارە "الاجماع"، دێتەدی، "بالاثنان"،واتە: بە دووان).

٢ – مەرج نی یە، ( أهل الاجماع ) خەڵکی مەدینە بن، یان لە هاوەڵان"صَحابة"، بن، یان لە "آل البیت"، بن.

٣. هەرووەها مەرج نییە، هەموویان یان زۆربەیان مردووبن، هەروەها لە دوای ئیجماع گەڕانەوە نییە. (لا یجوز الرجوع، بعد الاجماع).

- أنواع الاجماع ( بەشەكانی ئیجماع ):

الاجماع بحسب وصفة :

١ – صريح .

٢ – ضمني .

الاجماع بحسب المعرفة :

١ – منقول .

٢ – محصل .

الاجماع بحسب طبيعته :

١ – الفعلي.

٢ – القولي.

الاجماع بحسب سندة :

١ – قائم على أساس القرآن .

٢ – قائم على أساس السنة .

٣ – قائم على أساس القياس .

٤ – قائم على أساس المصلحة .

یەكەم: الاجماع بحسب وصفه ( ئیجماع بەپێی وەصفەكەی ) اما صريح او ضمني :

أ: الاجماع الصريح (ئیجماعی ڕاشكاوانە): بریتی یە لە یەكدەنگیی هەموو موجتەهیدەكان لەسەرحوكمێك، لە ڕووداوێك، كە دێتە بەردەمیان بە ڕاشكاوی، واتە، موجتەهیدەكان بەڕاشكاوی بۆچوونی خۆیان دەردەبڕن، هەر یەكە لە موجتەهیدەكان شتێكی وایان لێ دەردەكەوێ، كەبەڵگەبێ لە سەر بۆچونەكەیان ئیتر بە قسە بێ، یان بە كردەوە، ئەم جۆرە ئیجماعە زۆر كەمە، لە هەموو سەردەمەكانی ئیسلامدا.

*نموونە لە سەر (الاجماع الصریح): ئیتیفاقکردن، لە سەر کۆکردنەوەی قورئان لە سەردەمی ڕاشیدیندا.

ب. الاجماع الضمني (السکوتی): واتە، هەندێ لە موجتەهیدەکان بڕیار لە سەر مەسەلەیەك بدەن، موجتەهیدەکانی تر بێ دەنگ بن، بە مەرجێك

بێدەنگیی موجتەهیدەکان بەڵگەبێ، لە سەر ڕەزامەندیی، و موافەقە، نەك لە سەر ئینکاریی، و موخالەفە.

دووەم: الاجماع، بحسب معرفته، إما اجماع محصل، او منقول:

أ. الاجماع المحصل:" هو الاجماع الحاصل، بعد تتبع أقوال الفقهاء"، بریتی یە لەو ئیجماعەی کە بەدی دێت، دوای شوێنکەوتنی ووتەی فوقەها.

ب.الاجماع المنقول:": هو الذی نُقِلَ اِلینا فی احد المراجع الفقهیة المعتمدة"، ئەو ئیجماعەیە، کە لە یەکێك لە سەرچاوە فیقهییە باوەڕ پێکراوەکانەوە، پێمان گەیشتووە.

سێیەم : الاجماع بحسب طبیعته، اما قولي، او فعلي:

أ. الاجماع القولي: واتە موجتەهیدەکان بە قسە بۆچوونی خۆیان دەردەبڕن.

ب – الاجماع الفعلی: بریتییە لە (عورفی عام)، کە هەموو فوقەها، لە سەری دەڕۆن.

<u>تێبینی:</u> ئیجماعی فوقەها، تا ڕادەیەك لە (السوابق القضائیة)، یان ( عرف المحاکم ) یان (سیرةالقضاة، في القانون) دەچێت، بۆچوونی جیاواز هەیە، لە نێوان یاساناسان سەبارەت بە (السوابق القضائیة)، کە ئایا سەرچاوەیەکە لە سەرچاوەکانی یاسادانان یان نا ؟ بە هەمان شێوە، بۆچوونی جیاواز هەیە، لە نێوان (الاصولیون)، سەبارەت بە ئیجماع، ئایا سەرچاوەیەکی تەشریعیی سەربەخۆیە، یان سەرچاوەیەکی تەشریعیی کاشیفە.

*** چوارەم: الاجماع بحسب سنده:**

أ. الاجماع القائم علـــى أساس القرأن:

ب. الاجماع القائم على أساس السنة:

ج. الاجماع القائم على أساس القياس:

د. الاجماع القائم عـلى أساس المصلحة:

١. الاجماع القائم عـــلى أسـاس القـرأن: ئیجماعی فوقەها، لە سەر ئەوەی کە (کچی کوڕ)، لە ئاستی (کچ)دایە، لە کاتی نەبوونی (کوڕ)، و (کچ)دایە، هەروەها (کوڕی کوڕ)، لە ئاستی (کوڕ)دایە، لە کاتی نەبوونی کوڕ، و کچ، بە پشت بەستن، بە گوتەی خوای گەورە، لە قورئانی پیرۆز کە دەفەرموێت: (يُوصِيكُمْ اللَّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ فَإِنْ كُنَّ نِسَاءً فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ وَإِنْ كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ وَلأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِنْ كَانَ لَهُ وَلَدٌ فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ الثُّلُثُ فَإِنْ كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ السُّدُسُ مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا أَوْ دَيْنٍ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ لاَ تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعًا فَرِيضَةً مِنْ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا، النساء: ١١)، چونکە ووشەی (الولد) شمولی (بنت ابن، وابن ابن) دەکات.

٢. الاجماع القائم على أسـاس الـسنة: ئیجماعی زانایان لە سەر ئەوەی (اختلاف الدین: جیاوازی ئایین)، ڕێگرە لە میراتگرتن، بە پشت بەستن، بە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ،( لا يتوارث أهل ملتين ).

٣. الاجماع القائم علی أسـاس القيـاس: ئیجماعی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، لەسەر شەڕکردن، و کوشتنی ئەو کەسانەی کە زەکات نادەن، بە قیاس کردن، لە سەر (تارك الصلاة)، چونکە ئەوانەی کە (تارك الصلاة)ن، دەکوژرێن، خوای گەورە دەفەرموێت: ( وأقيموا الصلاة، و اتوا الزكاة، و اركعوا مع الراكعين...البقرة– ٤٣)، زەکات، و نوێژ، هەردووکیان دوو پایەن، لە پایەکانی ئیسلام، بۆیە ﴿ئیمام ئەبوبەکری صدیق﴾، لە

شەڕی هەڵگەڕاوەکاندا فەرمووی: (والله لا أفرق بين ما جمع الله) ([١٥])، واتە سوێندبێت بەخواجیاوازی ناکەم لەنێوان نوێژوو زەکاتدا.

٤. الاجماع القائم على أساس المصلحة: ئیجماعی هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ، دەربارەی (قتل الجماعة بالواحد)، لەسەر ئەوە کۆکن، کە چەند کەسێك هەستان، بە کوشتنی کەسێك، دەبێت، هەموویان بکوژرێنەوەن بەرژەوەندیی لێرەدا، (پاراستنی گیانی خەڵکانە، لە تاوانباران، و لادەران).

*حكم الاجماع:

١. ئەگەرئیجماع ڕاشکاو(صريح)، یان ڕوون بوو، پێویستە کاری پێ بکرێت، و نابێت بە پێچەوانەکەی کار بکرێت، ئەگەر سەنەدەکەی دەلیلێکی قەطعی بوو، لە قورئان، و سوننەت، ئەوا موخالەفە کردنی کوفرە، و دەرچوونە لە دین.

٢. ئەگەر سەنەدەکەی بەڵگەیەکی گوماناویی (ظنی) بوو، موخالەفە کردنی (فسق، و بیدعە)یە!

٣. ئەگەر ئیجماع (ضمني) بوو، ئەوا (حوججەیە)، بەڵام لەم جۆرەیاندا جیاوازیی هەیە، لە نێوان فوقەها، و ئوصوڵییەکاندا ، بۆیە جمهور لە سەر ئەوەن، کە حوججەیە، وپێویستە کاری پێ بکرێت، بەڵام حەنەفییەکان دەڵێن، حوججە نییە!

– ئایا ئیجماع ڕوودەدات؟

هەندێ لە زانایان، پێیان وایە، کە ڕوودانی ئیجماع، شتێکی نەگونجاو، (غير ممكن)ـە، بەڵام لە بەرامبەر ئەم زانایانەدا، ژمارەیەکی تر، لە زانایان ڕایان وایە، کە ڕوودانی ئیجماع گونجاوە، و (غير ممكن) نییە.

١. ئیجماع لە هەندێ بابەت، لە نێوان موجتەهیدەکاندا مومکینە، و دەکرێت ڕوو بدات، بەڵام لە بابەتی تازە، و نوێ، غەیرە مومکینە، و ڕوونادات.

٢. ئیجماع لە ناو مەزهەبێك، یان خوێندنگەیەکی یاسایی (مدرسة قانونية)، یان فیقهی دەکرێت، ڕوو بدات، بەڵام لە سەر ئاستی هەموو مەزهەبەکان مومکین نییە.

---

١٥. أخرجه مسلم، في كتاب الايمان.

٣. ئیجماع لە ناوچەیەکی دیاریکراودا، مومکینە، و ڕوو دەدات، بەڵام لە چەند ناوچەی جیاوازدا (بلاد عدیدة)، مومکین نییە، ڕوو بدات.

٤. ئیجماع لەم بارودۆخە سیاسیی، و ئابوری و کۆمەڵایەتیەی کە تیایدا دەژین، مومکین نییە، ڕوو بدات، بەڵام لە بارودۆخی میثالی ونموونەیی کە پڕۆسەی لێکتێگەشتن، جێگای (شقاق، و نفاق) بگرێتەوە، ئەوا ئیجماع مومکینە.

– هەڵوەشانەوەی ئیجماع بە ئیجماعێکی تر:

– زۆربەی زانایان ڕایانوایە، کە ناکرێت، ئیجماع هەڵبوەشێنرێتەوە، و ئیلغا بکرێتەوە، بە ئیجماعێکی تر، چونکە ئیجماعی پێشوو (الاجماع السابق)، نابێ موخالەفە بکرێت، و هەڵبوەشێتەوە، بەڵام زانایانی تر دەڵێن:

١. ئەگەر سەنەدی ئیجماع (قەطعی)بوو، نابێت بە هیچ شێوەیەك ئیلغا بکرێتەوە.

٢. ئیجماع ئەگەر سەنەدەکەی بەرژەوەندییەکی کاتیی، (مصلحة مؤقتة) بوو، بۆ کات وشوێنێك، (زەمان، و مەکان) ئەوا دەکرێت، هەڵبوەشێنرێتەوە، هەرکات ئەو بەرژەوەندییە، کۆتایی هات ونەما، چونکە بەرژەوەندیی (مصلحة)، لە گەڵ (العلة)دایە، و حوکم لە گەڵ (علة)دایە، بە بوون، و نەبوون، (الحکم دائر مدار العلة، وجودا و عدما)، عیللە هەبوو، حوکم هەیە، و ئەگەر نەبوو، حوکمیش نییە!

﴿القياس﴾

قياسهم حَمْلٌ لِمعلومٍ على مثلٍ لهُ، اِذا تَساوِ حَصَلا
فى علّة الحكم فإن توجبه فبِقياسِ علّة لَقّبْهُ
أمّا اِذا دلّت عليه فَقِياس دلالة عندهم بلا التباس
اَو كان ذاك الفرع قد تَرَدَّدا من بَين اَصليْنِ له قد وُجِدا
و أَلحقوه يا اَخى بالاشبَهِ فهو لديهم قياس الشبَهِ
و اشترطوا لِحُكمِ ذاك الاصل ثبوته اَى بدليلِ فصلِ
و اشترطوا ايضاً لَهُ اِطّراداً كذاك علّةٌ، فَكُن جَواداً
و هى التى قد جَلَبَت للحكمِ فاسمع لِذا تَسْمُ بِحسن الفهم
اِن لم يَكُن لحادثٍ دليل أِحتَجَّ باستصحابِ اَصلِ جيل
و أصلُ ضارٍ حُرمةٌ و النافعُ حِلٌ، و ذا بعدَ الرسول الشافعﷺ

---

## ﴿ چوارەم: (بەراورد، و بە بەرداگرتن: القياس) ﴾

پێناسەکەی:

القياس، فى اللغة، هو التقدير، والتسوية.

قياس، لە زماندا، بریتییە، لە ئەندازە دانان، و تەقدیرکردن، لە زارەوەیشدا "فى الاصطلاح"، بە یەکگەیاندنی ئەو حاڵەتەی، کە دەقی لە سەر نییە، بە حاڵەتێك، کە دەقی لە سەر هاتووە، لە حوکمدا، بە بەڵگەی ئەوەی کە هاوبەشن لە (عیللەتدا).

دەتوانین ئەم پێناسەیەیشی بکەین: (بریتییە، لەو یەکسانییەی لە نێوان فەرع، و ئەصڵدا، لە عیللەتی وەرگیراو، لە حوکمی ئەصڵەکە).

پایەکانی:

پایە، و ڕوکنەکانی قیاس چوارن:

١. المقيس عليه (الاصل): واتە، ئەوەی کە قیاسەکەی دەکرێتە سەر.

٢ – المقيس (الفرع) : واته، قیاسکراوەکە، ئەوحاڵەتەیەکەئەمانەوێت قیاسی بکەین لە سەر ئەصڵدا .

٣ – حكم الاصل : حوکمی ئەصل واتەئایاواجبە ، یاتەحریمە ، یائیباحەیە ، یاکەراهەتە ، یا نەدبە .

٤ – العلة ( عیللەت ) : بریتی یەلەووەصفە هاوبەشەی کەلەنێوان فەرع و ئەصڵەکەدا یەوکۆیان دەکاتەوە ، بەهۆی ئەوەوەقیاسەکەکراوە .

طرق معرفة العلة : ١ – بالنص والاجماع . ٢ – الاجتهاد .

* جۆرەکانی قیاس : قیاس چەندجۆرێکی هەیە :

١ – بحسب الوضوع : أ – القياس الجلي ب – القياس الخفي .

٢ – بحسب وجود العلة، في الفرع : أ – قياس الاولى ب – قياس المساواة ج – قياس الادني .

٣ – بحسب التوصل الى العلة : أ – قياس منصوص العلة ب – قياس مستنبط العلة .

١ ) القياس بحسب الوضوح : أ – القياس الجلي : بریتی یە لەو قیاسەی کە موجتهید دڵنیایە، لە عیللەتی حوکمی یەقینی ودڵنیایی .

ب – القياس الخفي : بریتی یەلەوقیاسەی کەموجتەهید، بەگومانە"یظن"، لە عیللەتەکە .

٢ ) القياس بحسب وجود العلة في الفرع :

أ – قياس الاولى : عیللەت لەفەرعدابەهێزترەلەعیللەت لەئەصڵدا ، بۆنموونە:(الضرب على التأفيف: قیاسی لێدان، لە سەر ئۆفکردن)، خوای گەورەدەفەرموێت : ( فلا تقل لهما أف، و لا تنهرهما، الاسراء:٢٣).

ب – قياس المساواة: عیللەت لەفەرعدایەکسانەبەعیللەت لەئەصڵدا، نموونەقیاسی سووتاندنی ماڵی هەتیو ولەسەرخواردنی چونکەسوتاندنیش وەکو خواردن لە ناوبردنە، خوای گەورە نەهی کردووە، لە خواردنی ماڵی بە ناهەق.

ج – قياس الأدني : عيللەت لەفەرعدا لاوازترە، لە عيللەت لە ئەصلدا، قياسی سێو لە سەرگەنم، لە حەرامێتی ڕيبادا، چونكە هەردووكيان هەر خواردنن.

مەرجەكاني قياس: بۆ ئەوەی قياس ڕاست و درووستبێ پێويستەهەريەكە لە (الحكم – العلة)دا، پێويستە هەبن، كە لەم خاڵانەی خوارەوەدا ڕوونی دەكەينەوە

يەكەم / شروط الحكم :مەرجەكاني حوكم : زانايانی ئوصوڵ چەندمەرجێكيان هەيەبۆحوكم، بۆ ئەوەی قياس ڕاست و دروست بێت، كە لە حەوت خاڵدا كورتی دەكەينەوە :

١ – پێويستەحوكمەكەحوكمێكی شەرعی بێت ، ( لغوی و عقلی ) نەبێت ، شەرعيی وەكو، ( حەلاڵ ، حەرام ، ندب ، كراهة، الصحة، البطلان، فساد، ... هتد)، قياس ناكرێ لە سەر حوكمی (اللغوی – عەقلّی).

٢ – پێويستەحوكمی ئەصڵی عيللەتەكەی عەقڵ هەستی پێبكات ، چونكەقياس كاتێك دێتەدی ئەگەر حوكمێك عيللەتەكەی بزانرێت، عيللەتيش ڕووی لەيەك چوونە لەنێوان ئەصڵ وفەرعدا .

٣ – نەبێت حوكمەكەمەنسوخ نەبێت ، چونكەمەنسوخ كاركردن پێی بەتاڵە ، هەرشتێكيش لەسەرباتڵ بنيات نرابێت، ئەوا بەتاڵە.

٤ – نابێت حوكمی ئەصڵ لەدوای فەرع هاتبێت، بۆ نموونە، قياسی دەستنوێژ نابێت، لە سەر تەيەمووم بێت.

٥. پێويستە "حوكمی ئەصڵ"، ثابت بووبێ، بە دەق،"نص"، يان بە ئيجماع، دروست نييە، قياس بكرێ، لە سەر ئەسڵی حوكمێك، ثابت نەبووبێ، بە يەكێ لەو، دوو سەرچاوەيە، چونكە قياسكردن، لە سەر ئەسڵی يەكەم لە پێشترە. (القياس علی الاصل الاول أولی بأعتبار).

٦. نابێت حوكمی ئەصڵ حوكمێكی نائاسايی(استثنائی)، بێت، لە ڕێسا، و بنەمای گشتيی، بۆ ئەوەی بەها، و سوودی(استثناء)، بمێنێ، واتە، نابێت ئەصڵ ببێت، بە (استثناء)، و (استثناء)يش، ببێت بە ئەصڵ.

بۆ نموونه، هاوەڵێکی بەڕێزی پێغەمبەرﷺ، (خوزەیمەی کوڕی ثابت)، شایەتیدانی بە دوو شاهیدیی دەچوو، کە ئەمەش(استثناء)ـە، لە بنەمای شەهادە، لە دوای ئەم حاڵەتەوە نەبینراوە، ڕۆژێ لە ڕۆژان قازییەکی ئیسلام، قیاسی کەسێکی تر بکات، لە سەر (خوزەیمەی کوڕی ثابت)، چونکە حوکمی (خوزەیمەی کوڕی ثابت)، (استثناء)، بووە، لە سەر ڕێسا، و بنەمای گشتیی شەهادە، بنەمای گشتیی شاهیدیدان دەبێت، دوو کەس بن، یان هەر شتێکی تر، لە حوکمی ئەو دوو کەسەدا بێت.

٧. نابێت بەڵگەی ئەصڵەکە، بە عیبارەتێکی ئاشکرا، (فەرع)ـەکە، بگرێتەوە، بۆنموونە، قیاسی هەموو سەرخۆشکەرەکان ناکرێ، لە سەر (خمر)، چونکە دەقی حەرامکردنی خەمر، دەقێکە لەسەر حەرامکردنی هەموو سەرخۆشکەرێك، و هەموو موخەدیرێك.

### دووەم: مەرجەکانی عیللەت:

لە زمانەوانیدا، بریتییە لە هەموو، ئەو شتانەی کە دەبنە هۆی گۆڕان، لە حاڵەتێکەوە، بۆ حاڵێتکی تر، بۆ نموونە، نەخۆشیی عیللەیە، چونکە نەخۆش باری تەندرووستی دەگۆڕێت، زانایانی بواری ئوصولێ بۆ ڕاستی قیاس، قیاسیان بەستووەتەوە، بە بوونی چەند مەرجێك لە عیللەدا، چونکە عیللەت میحوەری قیاس، و ئەرکانی قیاسە.

### مەرجەکانی عیللە:

١. ئەبێت عیللە هەبێت، لە ئەصڵێ وفەرعدا.

٢. نابێت عللە ئیلغا بووبێتەوە، لە فەرعدا، بە دەقی ئاشکرا، و ڕوون.

بۆ نموونە، قیاسی (بنت) ناکرێت، لە سەر (ابن)، و، قیاسی (الاخت) ناکرێت، لە سەر (الاخ)، و هۆی یەکسانییان، و نزیکییان بە هەمان پلە، چونکە قورئان خۆی یەکلایی کردۆتەوە، کە: ﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنثَيَيْنِ فَإِن كُنَّ نِسَاءً فَوْقَ

اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ وَإِنْ كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ وَلأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِنْ كَانَ لَهُ وَلَدٌ فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ الثُّلُثُ فَإِنْ كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ السُّدُسُ مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا أَوْ دَيْنٍ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ لاَ تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعًا فَرِيضَةً مِنَ اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا(١١) ﴾[١٦]

٣ – نابێت بۆ عیللە "مانع" ڕێگر، هەبێت، کە ڕێگری بکات، لە سەر"حكم المقيس"، بۆیە بکوژ، پێویستە بکوژرێتەوە، بەڵام باوک کوڕی خۆی بکوژێت، ناکوژرێتەوە، چونکە باوکایەتی ڕێگرە، لە (قصاص)، لای جمهوری فوقەها.

قۆناغەکانی قیاس : قیاس بەچوارقۆناغدا تێدەپەڕێت :

١ – تخريج المناط .

٢ – تحقيق المناط .

٣ – تنقيح المناط .

٤ – تثبيت المناط .

المناط : واتەئەوەی کەحوکمەکەی پێوەبەستراوەتەوە ، واتە عیللە، حوکم بە بوون و نەبوون لەگەڵ عیللەدایە ، ئەگەر عیللە هەبوو، حوکم هەیە، ئەگەر عیللە نەبوو، حوکم نییە.

گرنگیی قیاس: گرنگییەکان لەم خاڵانەدا کۆ دەبنەوە :

١ – قیاس وەسیلەیەکەلەوەسائیلەکانی تەفسیری دەقەکان و فراونکردنی مەودایان

٢ – قیاس هۆیەکەبۆکۆکردنەوەی لێچووەکان و هاوبەرامبەرەکان لە ژێر قاعیدەیەکی شەرعیدا، "الاشباه، والنظائر".

٣ – قیاس ئیستدلال کردنەبە عیللەتی حوکمێك لەسەرجێگیربوونی بۆ هەموو قەزییەیەك کە تیایدا، ئەو عیللەتەی تێدا بێت .

---

١٦ سورة النساء: ١١

٤ – قیاس یەکێکە لەگرنگترین وەسائیلەکان لە ئیجتهاددا ، واتە، لە موتابەعەکردنی مەسەلە نوێ، و تازەکاندا بۆ زانینی حوکمەکانیی لەبەر ڕۆشنایی ئەو دەقەدا.

٥ – قیاس ئامرازێکی گەڕانەوەیە، لە جوزئیاتەوە، بۆکولیاتی (قورئان، و سونەت).

٦ – قیاس گرنگییەکی زۆری هەیە، لە تەشریعاتە ( وضعي ) یەکاندا هەر چەندە، ئەو تەشریعاتانە، قابیلن بۆ گۆڕان، و ئاڵوگۆڕ، بەڵام قیاس لە شەریعەتی ئیسلامدا، گرنگییەکی زۆرتری هەیە، چونکە شەریعەتی ئیسلامی تەنها باسی لە قەواعیدە کولییەکان، و مەبادیئە عاممەکانی کردووە، تەفصیلات و جوزئیاتی واز لێ هێناوە، بۆ عەقڵە بەشەرییەکان.

حوکمی قیاس: قیاس حوکمی زۆری بە پێی بارودۆخ، و ئەحواڵ، و کەسەکان بەم شێوەیە:

١ – قیاس واجبێکی عەینییە : لەکاتی ڕوودانی ڕووداوێکی دیاریکراودا، کە دەقی لەسەر نییە، و لە ناوچەکەیشدا یەك قازی هەبێت، واتە، قازیی تر نەبێت.

٢ – قیاس واجبی کیفائیة: دەبێت ئەگەر ئەو ڕووداوە، لە ناوچەیەکدا ڕوو بدات، کە چەند قازییەکی تێدا بێت.

٣ – قیاس مەندوبە : بۆئەو مەسائیلانەی کەڕوویان نەداوە، بەڵام پێشبینی ڕوودانیان دەکرێت .

٤ – قیاس حەرامە : ئەگەرکەسێك پێی هەستێت کەمەرجی ئیجتهادی تێدانییە .

٥ – قیاس (خلافي أولى)یە: ئەگەر موجتەهیدێك قیاسێك بکات، بە ئامادە بوونی موجتەهیدێکی، لە خۆی زاناتر!

٦ – قیاس موباحە : کە لە ڕووداوە ئاسانەکاندا (أوضاع عادیة)، وەك، بۆ فێربوون، و خۆڕاهێنان.

